

# دیوانی

# ئەحمەد موختار جاف






لێکدانەوەو پێشەکی
د.عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ



دیوانی

# ئەحمەد موختارجاف

ئامادەکردن و بەراوردکردن و لێکدانەوە و پێشەکی بۆ نووسینی

پرۆفیسۆر دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ




بڵاوكراوەی كتێبخانەی هەژارموكریانی

سەرپەرشتی چاپ: عەتا ڕەووف

٠٧٥٠١١٧٣٩٢١

- ناوی كتێب: دیوانی ئەحمەد موختارجاف
- ئامادەكردن‌و لێكدانەوەو پێشەكی: د. عزالدین مستەفا ڕەسوڵ
- ساڵی چاپ: ٢٠١٦
- تایپ: دانیار عەتا
- نەخشەسازی بەرگ‌و ناوەوە: دانیار عەتا
- چاپخانە: تاران – پەنجەرە
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: ٥٠٠٠
- ژمارەی سپاردن: ٣٥٠

# بەرایی

لە درێژەی ئەو بەرنامەی کارەی کە کتێبخانەکەمان بەردەوامی پێدەدات بۆ چاپکردن و سەر لە نوێ لە چاپدانەوەی کتێب بۆ دەستپێکی ساڵی نوێی ٢٠١٦ هەستاین بە چاپکردنەوەی دیوانی ئەحمەد موختار جاف بە فۆرمێکی نوی وکوالیتیەکی بەرزەوە کە لەگەڵ سیمای کتێبخانەی نوێدا بگونجێت ..

ئەم بەرهەمە کە مێژووی چاپی یەکەمی بۆ ساڵی ١٩٨٦ دەگەڕێتەوە یەکێکە لە شاکارەکانی دنیای ئەدەبی کوردی و لە سەر ژیان وبەرهەم و شیعرەکانی شاعیری ناوداری کورد ئەحمەد موختار بەگی جاف ڕادەوەستێ و تیشك دەخاتە سەر خەرمانی زۆر و زەوەندی ئەو کەڵە پیاوە کە جگە لە بوارە ئەدەبییەکەی و توانا کەم وێنەکەی لە سەلیقەی شیعریدا هەروەها لە سەرەتاوە لە پێشەکیەکانی هەریەکە لە بەرێزان دکتۆر ئەفراسیابی کوریان و دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوڵەوە باس لە پێگەی کۆمەلایەتی و ئیداری و شۆرشگێرییەکەشی کراوە کە بێگومان ئەحمەد موختار جاف بەو خەسڵەتانەیەوە بووەتە ناوێکی گرنگ وکاریگەر لە مێژووی نەتەوەکەماندا کە خاوەنی چەندین هۆنراوەی بەرز و شۆرشگێریە کە پێویست دەکات نەوەی نوێ لێی بە ئاگا بن وئاوڕی لێبدەنەوە هەر لەم سۆنگەیەشەوە ئێمە ئەم دیوانەمان خستە بەرنامەی کارمانەوە و بڕیاری چاپکردنەوەیماندا وە هیوادارین بتوانین دەرفەتی لە چاپدانەوەی دیوانی سەرجەم شاعیرانمان هەبێت و بەو کارەشمان مەڵۆیەك بخەینە سەر خەرمانی ئەدەبی کوردی وخزمەتێکیش بێت بە کتێبخانەی کوردی.

## کتێبخانەی هەژارموکریانی

# پێشەکی

د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

ئەحمەد موختار، کوڕی وەسمان پاشای گەورەی (جاف)ە[1]، کە ئەویش کوڕی محمد پاشای کەیخوسرەو بەگە . هەموو سەرچاوەکان لەسەرئەوەن کە لە ١٣١٦ ی هیجریدا لەدایك بووە . ئەم مێژووەش بەوە چەسپێنراوە کە لێکیان داوەتەوە (احمد مختاربك) بەئیملای کۆنی کوردیو حیسابی ئەبجەد ئکاتە ١٣١٦ ە[2] ئەو ڕێکەوتە ناوی شاعیرو ساڵی لەدایك بوونی یەکخستووە . لەبەرئەوەش کە ڕۆژی لەدایك بوونیمان دەست نەکەوت ئەبێ تەنها ئەوەندە بڵێین کە ١٣١٦ ی هیجری ڕێکەوتی دوو ساڵی (١٨٩٨–١٨٩٩) ی میلادی ئەکات .

وەسمان پاشای باوکیو مەحموود پاشای مامی، هەردووکیان لەئومەرای بەناوبانگی عەشایری جاف بوون . لەلایەن سوڵتانی عوسمانی یەوە ڕوتبەی پاشایەتی یان درابوویەو لەهەڵەبجە حاکمێتیو قایمقانی یان کردووە[3].

---

[1] ڕەفیق حیلمی شیعرو ئەدەبیاتی کوردی، ب١، بەغدا ١٩٤١ . ل١٣ .

[2] احمد مختار بك

١+٨+٤٠+٤+٤٠+٦٠٠+٤٠٠+١+٢٠٠+٢+٢٠=١٣١٦

هەر بەمەشدا دەرئەکەوێت کە ئەحمەد موختار ناوی لێکدراو واتە (مرکب)ەو لەسەر پێڕەوی دەوری عوسمانی شاعیر ناونراوە (ئەحمەد موختار) . هەرچی تەخەللوسی شاعیرانەیە ئەوە (ئەحمەد) ی بۆ خۆی هەڵبژاردووەو لە قەسیدەیەکدا نەبێ (موختار) ی بەکارنەهێناوە . مامۆستا گیوی موکریانی باسی ئەوە دەکات کە سەردەمێك تەخەللوسی (گوڵشەن) بووە . بەڵام هیچ شیعریمان بەو ناوەوە دەست نەکەوت .

٣ ڕەفیق حیلمی . ئەو سەرچاوەیە . ل ١٣

دایکی ئەحمەد بەگیش کە ناوی (عادیلە خانم) بووەو بە خانم یا خانمی وەسمان پاشا ناوبانگی دەرکردووە، یەکێك بووە لە ژنە هەڵکەوتوو و دیارو یە دیمەنەکانی کورد[٤] .

ئەحمەد موختار وەکو هەموو منالێکی تر لە حەوتساڵیدا ئەخرێتە بەر خوێندن لە قوتابخانەی مندالأن لە هەڵەبجە، قورئان و کتێبە وردەکان تەواو ئەکا، لە پاش ئەمانە دەست ئەکا بە گوڵستان و خوێندنی فارسی تر، لە پاشا کەمێکیش عەرەبی ئەخوێنێ و دەستی لێ هەڵئەگرێ و خەریکی سەرو سواری و موڵکداری ئەبێ[٥] .

مامۆستا سوجادی لە سیفەتەکانی ئەحمەد موختاردا ئەوە دەست نیشان ئەکات کە حەزی لەخوێندنەوە کردووەو پاش ئەوە باری خوێندەواری ئەو هەڵئەسەنگێنێ و ئەنووسێ:-

کە ورد ئەبیتەوە لەم خوێندنەی (ئەحمەد موختار) ە تەماشا ئەکەی شتێکی وای نەخوێندووە، لەگەڵ ئەوەش تاپۆیەکی زیرەکی بووە، زمانی فارسی و عەرەبی و

---

٤ لەزۆر سەرچاوەی مێژووی سەردەمدا باسی (خانم) کراوە . ئەگەر ئەم سەرچاوانە جیاوازی یان لە باسی هەلوێستی سیاسی خانمدا هەبێ، ئەوا هەموو لە باسی توانا و هەڵکەوتوویی و دەسەلأتدارییدا یەکن . ئەوەی ئەتوانین لە باسی ناو ئەو سەرچاوانەی زیاد بکەین ئەوەیە کە خانم دەستێکی بالأی لە دامەزراندنی هەندێ دیمەنی شارستانێتیدا بووە، چ لەهەڵەبجەو چ لە سلێمانی و رۆڵی لەوەدا بووە کە عوسمان پاشا ژیانی شارستان و شارستانێتی لە ژیانی خێڵەکێتی پێ باشتربێ . هەرچی بنەچەی خانمە، ئەوە ئاشکرایە کە لە سنەوە هاتووە . هەندێك بەنەوەی بەنی (ئەردەلأن) ی دائەنێن (رەفیق حیلمی ل ١٣) و هەندێك بە نەوەی بەنی (ساحێبقران) ی ئەزانن (سوجادی ل ٥٤٦) . بەلأم نەوەکانی خانم کچی قادربەگی ساحێبقرانەو دایکی لە بنەماڵەی (وەزیری) بەناوبانگی سنەیە .

٥ علاو الدین سجادی . مێژووی ئەدەبی کوردی . بەغدا، ١٩٥٢ ل ٥٤٥ .

توركی زانیوه . تۆزە تۆزەیەکیش لە ئینگلیزی . تەنانەت لە فارسیدا گەلێ شیعری هەیە[6] .

ڕەفیق حیلمی لەم بارەیەوە پەنجە بۆ قەسیدەیەکی وەرگێڕراوی درێژ ئەکات و ئەنوسێت:-

---

٦ سوجادی، ل ٥٤٦

تێبینی: هەرچەندە لە چەند سەرچاوەیەکدا باسی ئەوە کراوە کە ئەحمەد موختار لە پاڵ کوردیدا بە زمانی تریش شیعری هەبووە، بەڵام بەداخەوە هەر یەك هۆنراوەی فارسی نەبێ هیچی تریمان دەست نەکەوت . (ئەم کتێبە لەژێر چاپا بوو لەبارەی شیعری فارسی ئەحمەد موختار جافەوە لەگەڵ برای بەڕێزم دکتۆر حەسەن جاف قسەم ئەکرد، باسی کۆمەڵێ شیعری فارسی ئەحمەد بەگی بۆ کردم لە کتێبخانەی مەجلیسی شوورای میللی ئێرانا . منیش داوام لێ کرد ئەوەی ئەیزانێ لەم ڕووەوە بۆم بنوسێ، ئەم چەند دێڕەی بۆ نووسیم:

ساڵی ١٣٥٣ ی خورشیدی (١٩٧٦ ی میلادی)، کاتێ خەریکی نووسینی تێز (ئوترووحە) ی دوکتۆراکەم بووم، لە کتێبخانەی مەجلیسی شوورای میللی ئێرانا چاوم بە دیوانێکی دەستنووسی ئەحمەد موختار جاف کەوت کە بریتی بوو لە ٣٥ صەفحە، پازدە صەفحەی ئەشعاری فارسی ناوبراو بوو . لەبەرئەوەی درەنگ بوو نەمتوانی هەموو ئەو ئەشعارانە بنوسمەوەو کاربەدەستی کتێبخانەکە نەیدا پێم ببیەمە دەرەوە چونکە ئەوە قەدەغە بوو . بڕیارم دا فرسەتێکی تایبەتی وەربگرم و فۆتۆیەکی بکەم . بەڵام دوای چەند ڕۆژێك هاتمەوە هەموو کتێبە کوردی یەکانیان جیاکردەوە ئەو نامیلکەم دەست نەکەوت . خۆش بەختانە هەر ئەوەڵ ڕۆژ ئەم سێ بەیتەم لە دوو پارچەیان نووسیبوەو لە ئوترووحەکەما جێم کردنەوەو گونجاندمن:

عاشقان روی تو از درد دل افتادەاند
در قمار عشق نقد جان و دل را باختند
افرین بر تیپ مژگان تو ای شکر کلام
چون سپاه بالقانی بر سر دل تاختند
یار من چون میخرامد سرورا رسوا کند
چون نگاهی میکند او، عالمی شیدا کند

ئەحمەد موختار بەگ، لە زمانی بێگانەیشەوە شیعرێکی زۆر بەرزو ڕەنگینی بۆ کردووین بە کوردی و بەم ڕەنگە هێزو توانای شاعیری خۆی و فەساحەت و بەلاغەتی خستۆتە بەرچاو[٧] .

هەموو ئەو سەرچاوانەی باسی ئەحمەد موختاریان کردووە هەر بەم چەشنە باسیان لە پلەی خوێندەواری کردووە، بەڵام هەمووشیان کە ئەنووسن (لە قوتابخانەی ئەهلی خوێندوویەتی، تەحسیلی مەکاتیبی ڕەسمی نەبووە[٨]) ئەوەیان لەبیرناچێ کە (بە زەکای فیتری)[٩] فێری چەند زمان بووەو گەیشتۆتە پلەیەکی باشی خوێندەواری[١٠]) . بەڵام لێرەدا ئەتوانین چەند قسەیەك لەم بارەیەوە زیاد بکەین و بڵێین:

ئەحمەد موختار بەپێی باری ڕۆژی خۆی و پلەی کۆمەڵایەتی و چینایەتی خۆی، پلەی سەرەتایی و ناوەندی خوێندنی بە پتەوی و باشی خوێندووە . چونکە کەسێك کوڕێکی نازداری (وەسمان پاشا) و (خانم) بووبێ کە هەردووکیان خوێندەواری یان زۆر لا مەبەست بووە، پێویستی بە فەقێیەتی و چوونە مزگەوت نەبووە و ڕێگەی قوتابخانەی ڕەسمی ئەو سەردەمەشی نەنراوەتە بەر، چونکە دایكو باوکی بە تەمای

---

٧ ڕەفیق حیلمی ل ١٧ .

تێبینی: وەك دەرئەکەویٚ ئەو شیعرانەی (سوللی برۆدۆم)مەحموود جەودەت بە پەخشان کردوویەتی بە کوردیو ئەحمەد موختار بە شیعر دایڕشتۆتەوە .

٨ نەجمەدین مەلا . مینای شکستە ، ب ٣ (دەستنووس) .

٩ هەر ئەویٚ: تێبینی: کاك مەحموود زامدار ئیشارەتی ئەوەی کردووە کە ئەم دەستنووسانەی لای کاك حەمە بۆر دیوە .

١٠ مامۆستا ڕەفیق حیلمیش لەم بارەیەوە نووسیویە: (هەرچەن لە خوێندنێکی بەرزو ڕێكو پێكو بەهرەدار نەبووبوو،بەڵام خاوەن زەکایەکی تیژو بیرێکی ورد بوو . کوردیو فارسیو تورکیو عەرەبیو کەمێکیش ئینگلیزی ئەزانی . بەکوردیو فارسی گەلێك شیعری دانابوو، ل١٧) .

ئەوە نەبوون بیکەن بە ئەفسەری تورك، کە خوێندنی ڕەسمی ئەوکاتەش زۆرتر هەر بۆ ئەوە بووە . بەڵام لەجێی ئەمە باشترین مامۆستای تایبەتی بۆ هێنراوەتەماڵەوە .

هەر لەماڵی خۆیاندا ئەلف و بێ و سەرەتای خوێندنی لەسەر دەستی شێخ محی یەدینی (باوکی شێخ جەمالی ئەرزوحاڵچی) ی هەڵەبجەدا خوێندووە . ناشزانم چ مەلایەکی تریش دەرزی عەرەبی پێ وتووە، بەڵام بۆ فارسی خوێندن، خۆم چەند جار لە مامۆستا گۆرانم بیستووە کە ئەیوت:-

باوکم – واتە سلێمان بەگی باوکی گۆران – دەرزی فارسی بە تایەربەگی وتبوو لەگەڵ ئەحمەد موختاردا پێکەوە دەرزی فارسی پێ ئەوتین . وەك ئەشزانین سلێمان بەگ یەکێك بووە لە فارسی زانەکانی سەردەمی خۆی و بە (کاتب فارسی) ش بەناوبانگ بووە . هەرچی ئینگلیزی خوێندنیشە ئەوە مامۆستا کاکەی فەللاح لە زمان ئەحمەد بەگی حەمە سالح بەگی جافەوە ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ کە لێم پرسی کەی مامۆستا گۆرانت ناسی، ئەحمەد بەگ وەڵامی دامەوە: ئەو دەمەی لە هەڵەبجە لەگەڵ ئەحمەد موختار بەگدا ئەمدین خەریکی زمانی ئینگلیزی بوون .

تێکڕا دیارە کە لە مەیدانی فێرکردنی زمانداو بۆ پەیداکردنی مامۆستای زمان دایك و باوکی قسووریان لێ نەکردووە . ئەوەندە هەیە کە ئەحمەد موختار خۆی زۆر زیرەك بووە و ئارەزووی فێربوونی هەبووەو پلەی خوێندەواری و شاعیرێتی و نووسەریی ئەو لەم پلەی خوێندنە زۆر بەرزترە و ئەمەش دەچێتە سەر وێنەی هەڵکەوتوویی ئەحمەد موختار .

## وێنەو ڕوخساری شاعیر:

گەلێك وێنەی شاعیرمان لە بەردەستدایە و تائێستاش زۆر کەس ماون کە لەنزیکەوە ناسیویانە و دۆستی بوون و کوڕو کچەکانیشی ماون لەگەڵ ئەوەشدا با بچینەوە سەر سەرچاوەی پێش خۆمان نووسراو .

مامۆستا ڕەفیق حیلمی ئەڵێ:

((لاوێکی شیرین‌و بالأبەرزو سوورو سپی بوو . بە چاوی شین‌و[11] مووی زەردی وێنەیەکی مومتازی ڕەگی ئاریی تەمسیل ئەکرد . زرنگ‌و شۆخ‌و تەرپۆش و لە ڕەغمی دەوڵەمەندی و ئەملاکێکی زۆر، ماڵ وێرانی سەخاوەت و دەس بڵاوی بوو...))[12] .

مامۆستا سوجادیش لەم بارەیەوە نووسیویە:

((....ئەحمەد موختار بەگ پیاوێکی بالأبەرزو سوورو سپی بووە، جوان چاك و شۆخ و شەنگ، چاو گەورەو دەم و چاو پان بووە، ڕیشی ئەتاشی و جووتێ سمێڵی قەیتانی ئەهێشتەوە . زۆر حەزی بە ڕاوو شکار کردووە، ڕاوچی‌و تفەنگچی و سوارچاك بووە تەرپۆش و دڵتەڕ، زۆرتر مراخانی و شەڕواڵی لەبەر ئەکردو شەدەو مشکی ئەبەست بەسەرەوە، پشتێنێکی تۆزێ زیادی ئەبەست و فەقیانەکانی هەڵئەکرد، گەڵێ جار دوو ڕیزە فیشەك‌و ستارخانی ئەبەست، لەگەڵ جلی کوردیدا چاکەت‌و پانتۆڵیشی لەبەرکردووە . لەگەڵ خواردنەوەدا سەودای بووە، یاریشی

---

١١ کاك ئەفراسیاب ئەڵێ: چاوی کاڵ بوو .

١٢ ڕەفیق حیلمی ، ل١٧ .

ئەکرد، پیاوێکی نان بدەو بەرچاو تێرو زۆر دەست بڵاو بووە[13] . ڕووخۆش و هەموو وەخت دەم بە پێکەنین بووە، لە شوێنی دوورەوە گوێ یان لە قاقای پێکەنینەکەی ئەبوو، هەڵسوکەوتی لەگەڵ هەموو جۆرە کەسێکدا ئەکرد، خوێندنەوەشی پێ خۆش بوو، لە قسەکردندا دەنگ گەورە بوو[14])) .

---

١٣ لەڕووی بەخشندەیی و دەست بڵاوی ئەحمەد موختارەوە گەلێ سەرگوزەشتە دەگێڕێتەوە . بۆ شایەتی ئەمە تەنیا یەك سەرگوزەشتەی چاپکراو دووبارە ئەکەینەوە . چونکە ئەم لایەنە بۆ چیرۆکی ژیان و تراژیدیای مەرگی ئەحمەد موختار بایەخێکی گەورەی هەیە .

محمد ئەمین کاردۆخی لە پێشەکی دیوانی مەلا حەسەنی قازی (شاهۆ) دا نووسیویە: (مەلا عەلی کوڕە گەورەی (شاهۆ) بۆی گێڕامەوە وتی:

باوکم لە بەغدا بوو، ئەوەڵی ساڵی ١٩٣٤ بوو (ئەحمەد موختار جاف) واتە (ئەحمەدبەگی عوسمان پاشا) لەسەر دوکانی (میرزا ڕەشیدی بانەیی) لە هەڵەبجە دانیشتبوو . منیش لەو کاتەدا هەر لەوێ دانیشتبووم . (پۆستەچی) بروسکەیەکی بۆ من هێنا . پێش ئەوەی بیکەمەوە (ئەحمەد بەگ) لە دەستی وەرگرتم، خۆی کردیەوە، سەیری کرد . برووسکەکەی خستە ناودەستی و نەیدا بە من . بە (عەلی ئەفەندی هەمپەل) ی ووت کە (وەکیل خەرج) ی بوو برۆ (٢٠بیست) ڕوپیەم بۆ بێنە . عەلی ئەفەندی چوو پاش کەمێك گەڕایەوە . ووتی: دەستم نەکەوت، هەمیسان پێی ووت: برۆ (ئاشەکان) بدە بە ئیجارەو (٢٠) ڕوپیەم بۆ بێنە . پاش نیو سەعاتێك هاتەوە، ئەمجارە پارەکەی بۆ هێنا، ئەویش پارەکەو بروسکەکەی دایە من و ووتی: باوکت داوای پارەی لە (تۆ) کردووە، ئەزانم تۆیش بە ئاسانی بۆت پەیدا نابێ . جارێ ئەمەی بۆ بنێرە . خوا کەریمە بەڵکو ئەمجارە لە ئیشێکدا دامەزرێت، منیش سوپاسم کردو پارەکەم بۆ باوکم نارد (دیوانی شاهۆ، کۆکردنەوەو ڕێکخستنی محمدئەمین کاردۆخی، ب٢،چ١، سلێمانی ١٩٨٠ ل٩)

کاردۆخی خۆی لەم سەرگوزەشتەیە ئەدوێ و ئەڵێ:

(لێرەدا خۆشەویستی بەینی (ئەحمدموختارجاف) ی شاعیرو شاهۆی شاعیرمان بۆ دەرئەکەوێت لەگەڵ بەخشندەگی (ئەحمەدموختارجاف) و بەکارهاتنی لەکاتی تەنگانەدا (هەرئەوێ، ل٩-١٠)

ئەگەر ئەمە شایەتی تەنیا بەخشندەگی بێ لای ئەو، ئەوە بەلای منەوە شایەتینی گەلێك سیفەتی مەردانەی ئەحمەد موختارە . بەتایبەتی شایەتی جاڵ و هەموو گەنجینە سەرف کردنێتی . ئەوەش بڵێین کە هەر لەو سەرچاوەیەدا لە باسی ژیانی (شاهۆ) دا وتراوە: (ئەحمەدموختارجاف لەکاتی خۆیدا لە هەڵەبجە پارچە ئەرزێکی بەخۆڕایی پێ دابوو بیکات بە خانوو ..) هەر ئەوێ ل١٣ .

وەك ئەشزانین ئەحمەد موختار لەم چەشنە ئەرزەی بە زۆرکەس بەخشیبوو .

١٤ سوجادی ل ٥٤٥ – ٥٤٦ .

# ژیانی

لە ژیانی ئەحمەد موختار لە سەرچاوەکاندا ئەوەندە نووسراوە کە لە ساڵی ١٩٢٢ دا قایمقامی هەڵەبجە بووەو لە ١٩٢٤ دا بووە بە نائیب لە پەرلەمانی عێراقیدا[١٥] . ڕاستی ئەوەیە کە لە ١٩١٩ وە تا ١٩٢٤ قایمقامی کردووە و پاشان بووە بە نائیب، بەڵام دوایی بەو چەشنەی خەڵکی ئەیزانن وازی لە هەموو ئەمانە هێناوەو شاری بەجێ هێشتووەو ڕووی کردۆتە چیا .

کە لەڕووی سروشت و بیرەوە تەماشای ڕەفتاری ئەحمەد موختار ئەکەین ئەبینین ئەم چەشنە پایەو کورسی یانەی لەلا بێ بایەخ بووە . ئەحمەد موختار لەڕۆژی خۆیدا چ لەباری پلەی خێزانەکەیەوەو چ لەڕووی لێهاتوویی و پێگەیشتوویی و خوێندەواری خۆیەوە باشترین کەسی عەشیرەتی جاف بووە کە سەرانی ڕژێم پشتی پێ ببەستن و پێشی بخەن و چرای سەوزی ئەو چەشنە بەرزبوونەوەیەشی بە ئاسانی بۆ هەڵئەکرا . بەڵام ئەحمەد موختار پشت ئەکاتە ئەم چەشنە سەرکەوتن و پێشکەوتنەو تەواو لێ یان یاخی ئەبێ . چونکە بەرزی لە پایەی پێشکەوتنێکدا نابینێ کە لە سایەی دوژمنداو بە مەرایی و سەرشۆڕی و ملدان بۆ بەرتیل و ڕیایی دەست کەوێت . ئەوەتا ئەحمەد موختار لە چیرۆکی (مەسەلەی ویژدان) دا گاڵتە بە کەسێك ئەکات کە ئەو چەشنە ڕێگەیەی گرتووەو وەك ئەم بووە بە قایمقام و نائیب و بە تەمای کاری گەورە تریشە . دیارە مەبەستی ئەحمەد موختار ئەوە نەبووە لەو ڕێیەوە بگاتە پلەی بەرزتر، خۆی لە زمان خەڵکەوە لەو چیرۆکەدا هیوای خۆی دەرئەبڕێ و ئەڵێ:

---

١٥ لە شوێنێکدا بەهەڵە نووسراوە کە گوایە ئەحمەد موختار لەکاتی حوکمڕانی شێخ مەحموودا وەکیلی ڕەئیسی شەرعو عەدل بووە . لە ڕاستیدا ئەو ئەحمەد موختارە ئەم نی یەو ئەحمەد موختاری قازی هەولێری یە . بڕوانە (حسين عارف، چیرۆکی هونەری کوردی، بەغدا، ١٩٧٧ ل٣٦) .

((......چونكه ئومێدمان وایه به تەحقیق ئەزانین كه هەقی مەزڵووم له زاڵم ئەسێنێ[16])) .

د. ئیحسان فواد له ڕوونكردنەوەیەكدا كه لەكۆتایی چاپكردنی ئەو چیرۆكەدایه لەم مەبەسته ئەدوێ و ئەنووسێ:

((......بێگومان ئەوەی هۆنراوەكانی شاعیر بەوردی بخوێنێتەوە، لەیەكچوونێكی تەواو ئەبینێ لەنێوانی هێندێ هۆنراوەی شاعیرداو ناوەڕۆكی ئەم چیرۆكەدا . شاعیری بەسۆز، خاوەنی هەڵبەستی (لەخەو هەڵسن)، له بەشێكی بەجێی هۆنراوەكانیدا، پەردە لەڕووی ناتەواویی كۆمەڵەكەی و دزی و ڕووتاندنەوەی كاربەدەستانی ئەو سەردەمە لائەدات و دەری ئەخات كه تا چ ڕادەیەك میللەتی هەژار یان چەوسانۆتەوە:

جاهیلان بۆ ئیستیفادەی زاتی خۆیان ڕۆژو شەو

لەم موحیته مەنعی عیلمو سنعەت و عیرفان ئەكەن

ڕووڕەشی دنیا و قیامەت ئەو نەفامانەن كەوا

هەجوی قەوم و میللەتی خۆیان به پارەو نان ئەكەن

ئاسمان ئێسته وەها چەرخاوە، جاهیل غالیبە

گوربەوو ڕێوی خەیاڵی مەرتەبەی شێران ئەكەن

چەند كەسێكی تازە پیاكەوتوو له كووره دەرچوون

---

١٦ ئەحمەدموختارجاف . مەسەلەی ویژدان، بەغدا، ١٩٧٠، ل٥٩ .

پیاو کە چوو بۆ ئیش لە پێشا یۆقلەمەی گیرفان ئەکەن

یاوەکو:

مەعنایی وەها لێك ئەدەنەوە بەعزێ مووەززەف

قانوون ئەوەتە کەشفی بکەن باخەڵ و گیرفان

دەسا، هەر ئەم ناوەڕۆکە ڕوونەیە کە لە سنووری تەنگەبەری هۆنراوەدا لەوەندە زیاتر دەرنابڕێ و کە ئەنجامی لێکدانەوەو سەرنجدان و شارەزایی شاعیرە لەو ناوەندەدا کە تیایا ژیاوە (بە تایبەتی کە خۆی چەن کارێکی میری بەڕێوەبردووە و بە چاوی خۆی کارەساتی بەڕێوبردنی دیوە) بۆتە هەوێنی ئەم سەرگوزەشتەیە[17]، لە سەرچاوەیەکی تریشدا کە باسی (مەسەلەی ویژدان) ئەکرێت چیرۆکەکە ئەبەسترێتەوە بە ژیانی ئەحمەد موختار خۆیەوە:

((.....بێگومان من بەو نیازە لەمێژووی ژیانی دەکۆڵمەوە، بە تایبەتی لەو سالانەدا، تا وەرامی ئەو پرسیارەم دەسگیر ببێ کە ئایا ئەحمەد موختارێك کە خۆی یەکێك بووە لە کاربەدەستە گەورەکانی ڕژێم، چ عەجەب لەو چیرۆکەیدا (ئەگەرچی بلاویشی نەکردۆتەوە)، ئەو هێرشە توندو تیژەی بردۆتە سەرو لەنێوانی کاربەدەستانی دەورو بازرگان و دەرەبەگەکانی پشتیوانیەوە، بەو جۆرە گوناهبارو ڕیسوای دەکات؟))[18]

نووسەر خۆی وەلامی پرسیارەکەی ئەداتەوە و ئەنووسێ:

---

١٧ مەسەلەی ویژدان، ل٦٢-٦٣ .

١٨ حسین حارف، ل٣٧ .

((....بەڕای من ئەحمەد موختار هەرچەندە ئەو کاربەدەستە گەورەیەی ڕژێم و ئەو بەچکە دەرەبەگ و (شازادەی کوردان) ە بوو، کە باسمان کرد، بەڵام ئەدیبێکی ڕووناکبیری خاوەن هەست و ویژدانێکی پاك بووە و لە دڵ و دەروونەدا دژی زوڵم و زۆری کاربەدەست و ئاغاو دەرەبەگە خوێنمژەکان بووەو بیروباوەڕو کردارو نەریتی کۆنەپەرستانەی لا ناپەسەند بووە . هەروەکو لە هەست و بیرو باوەڕی کوردایەتیشدا، ڕاستگۆو سەرڕاست بووەو بۆی دڵسۆز بووە . بۆیە ئەو ئەگەر چی ئەوەی لەناخی بیرو هۆشیدا باوەڕی پێی هەبووە بۆی نەلواوە بە کردار پێی لەسەر داگری و ڕاستەوخۆ کۆششی بۆ بکات، کە دەبێ بە هەردوو باری (زاتی و مەوزووعی)دا لەم ڕووەوە وەزعیمان لەبەرچاو بێ، بەڵام بە ئەدەب و بەشێوەیەکی تایبەتی لە چیرۆکەکەیدا زۆر بە ئاشکراو لەڕوو ئەو ئەرکی بەجێ هێناوە . واتە دەتوانین بڵێین: لە مەیدانی چالاکی ئەدەبیدا، ئەحمەد موختاری هەست و ویژدان پاکی کورد پەروەری دڵسۆز و ڕاستگۆ دەبینین کە وەك ڕووناکبیرێکی پێشکەوتنخواز قەڵەم دەخاتە سەر قاقەزو دەنووسێ، نەك بەچکە دەرەبەگێك و کاربەدەستێکی گەورەی ڕژێم .

بەم پێ یە ڕام بۆ ئەوە دەچێ کە ئەحمەد موختار خۆشی مەبەستی لە نووسینی (مەسەلەی ویژدان) ڕاستەوخۆ هەر ئەوە بووبێ کە ئێستا ئێمە تێی دەگەین . واتە ڕەخنەگرتن لە پەراگەندەیی سەردەمی خۆی و ڕیسواو ڕەجاڵ کردنی لەنێوانی ڕیسواو ڕەجاڵ کردنی نموونەی چەندین کەسانی دزو بەرتیل خۆرو تەڵەکەبازو خوێن مژو کۆنەپەرست ... هتد ... کە دەستنێژی ڕژێمەکە خۆی بوون و لە سایەی ئەودا ئاشیان گەڕاوە[١٩] .

---

١٩ هەر ئەوێ . ل ٣٨-٣٩ .

ڕەنگە بۆ زۆربەی وتەکانی نووسەر دەنگ بدەم، تەنیا ئەوە نەبێ کە لای وایە هەڵوێستی ئەحمەد موختار لە نووسیندا دیار بووەو لە کردارا دیار نەبووە . بەڵکو (لام وایە و هیوام وایە کە ڕاست بم) کە یاخی بوونی ئەحمەد موختار لە دەرەبەگی و ڕژێمی پاشایی و ناقۆڵایی کۆمەڵایەتی سەردەمی خۆی لە کرداریا زۆر دیار بووە و نووسین و کرداری یەکیان گرتۆتەوە .

پیرەمێرد بەم چەشنە لە (ژیان) دا هەواڵی مەرگی (ئەحمەد موختار) ی بڵاوکردۆتەوە:

(ناسۆرێکی تازە بۆ دڵی کوردەواری)

دوو میسرەع، یەکێ کەیخوسرەوانی

دووەمیان خاڵی ڕووی ئەردەڵانی

بووبوو بەشیعری جوان و نەوجوان

درێغا فەلەك خستیە ناو سیروان

((ئەحمەد موختار)) ی وەسمان پاشا لە باوکەوە کەیخوسرەوی، لە دایکەوە ئەردەڵانی، ئیفراتی سەخاو زەکا بووبووە نەگبەتی سەرشانی، خۆی داناو داخی بەدڵی عالەما نا:

شاعیر بوو، شاعیر ئەنجامی وایە

فەلەك بەزەیی بەکەسا نایە[20]

---

٢٠ ژیان، ژمارە ٤٣ ساڵی ١٠، ٩ی شوباتی ١٩٣٥ .

**ئەم ئیفراتی (سەخاو زەکا) یە وای لێ کردبوو کە بەو چەشنە دەست بڵاوبێ و گوێ نەداتــە مــاڵ و مــوڵکی جیهــان و لــەجیاتی مــاڵ و موڵــك زیــاد کــردن بکەوێتــە بڵاوکردنـەوەو بەخشین[21] . لـە جیاتی ڕوانینـە پایـەو بـەرزیی سـایەی ئـەو ڕژێمـە کـە ڕێی بۆکردبۆوە، یاخی بوون و کێونشینی لەڕێی مەبەستدا بکا بە پێڕەو و بڵێ:**

**جەژنی قوربان، ساڵی جارێ خەڵکی قوربانی ئەکەن**

**بۆ وەتەن من ڕۆژی سەد جار ڕۆحی خۆم قوربان ئەکەم**

**وێنەی قوربانی دان و شەهیدبوون لە شیعری ئەحمەد موختاردا بەچەشنێك دووبارە دەبێتەوە کە باری لێکدانەوەی (سایکۆلۆژی) دەمانباتە سەر ئەوەی بەدڵنیایی بڵێین: خــۆ بــەقوربانی نیشــتیمان کــردن و بەجوانەمــەرگی شــەهیدبوون کەڵکەڵــەی ســەرو ئاواتی هەمیشـەیی دەروونـی بـووە . ئـەبێ چـەند جار لـە شـیعری ئەحمـەد موختـاردا وێنەی فەرهاد لەپاڵ کێوی بێستووندا خوێن ڕشتن ووترابێتەوە:**

**بێستوون ئێستەش کە وەقتێ لالەیی لێ سەوز ئەبێ**

**باسی خوێنی دیدەو داغی دڵی فەرهاد ئەکا[22]**

---

21 ڕەفیق حیلمی لە باسی شیعری ئەحمەد موختاردا دوو لایەن باس ئەکا، لایەنی بەخشندەیی و لاینی نیشتمانپەروەری و ئەنووسێ:

(بێجگە لەمەیش کە خۆی ئەڵماس و گەوهەری دنیای زۆر لەبەرد داو سەروەت و سامانی بەشی خۆی لە باوکی یەوە بۆی مابۆوە لە بەینێکی زۆر کەمدا لەناوی بردو دوایی پێ هێنا، دیسانەوە دیاربوو کە بۆ سەروەتی وڵاتەکەی زۆر دڵسۆز بووە کە ئەڵێ:

زوبانی حاڵی ئەحمەد هەر ئەڵێ وریا بن ئەی میللەت

بزانن بەردی ئەم شاخانە ئەڵماس و گەوهەرتانە

(ڕەفیق حیلمی ل ١٧)

22 بیستون وەختێ کە لالەی ئەحمەری لێ سەوز ئەبێ

**لەزۆر شیعری ئەحمەد موختاردا وێنەی نیشتمان و دولبەر دەبێ بەیەك و خۆیشی هەر فەرهادە:**

**هیچ خەنە پێویست نی یە بۆ دەستو پەنجەی دولبەرم**

**وا بەخوێنی من خەریکە دەستو پێی نەخشین ئەکا**

**ئەگەر فەرهادی بێستوون لە نائومێدیدا بە دەستی خۆی لەناوچووبێ، ئەوا (فەرهاد)ی گوێ سیروان بە کۆمەڵێ ئاوات و نەخشەی مەزنەوە (بەدەستێکی نەفام[23]) لەناوئەچێت و داخی نیشتمان ئەباتە گڵەوەو نیشتمانیش یەکێك لەو کوڕە هەڵکەوتوانەی لەکیس ئەچێت کە جێگەی هیوا بوون .**

**ئەگەر باش لەبەرهەم و ژیان و مەرگی ئەحمەد موختار وورد بینەوە بەڕاستی دەبینین کە ئاواتی گەورەی هەبووە، خۆی لەخۆی گەیشتووەو تەمای ئەوەی هەبووە کە لەکاروانی پێشکەوتنو دووا ڕۆژی نیشتماندا جێی دیار بێ . گەورەییش لای ئەو**

---

مەشقی لێوی شەککەریی ناسکی شیرین ئەکا

ئەو گولاڵەی وا لەکێوی بێستوونا سەوز ئەبێ
چەن لەتیفو ئاڵە ڕەنگی لێوی شیرینی هەیە
......
ئەو گولاڵانە کە لەم کێوو کەژە خەدیمە ئەدەن
هەموو تەمسیلی ئەکەن خوێنی شەهیدانی تۆ
.......
گولاڵەی بێستوون ئێستەش بەهاران
ئەڵێن پێت ماجەرای فەرهادو شیرین
ئەم کۆمەڵی گولاڵە کە ئاڵن لەکێوو کەژ
ئاویان دراوە گشتی بە خوێنە ڕژاوەکەم
٢٣ ڕەفیق حیلمی ، ل١٧ .

وەك ووتمان – ماڵ و موڵك و پایەی بەرزی دەوڵەتی ئەوكاتە نەبووە، چونكە ئەوانەی لە بەردەستدا بووەو شەقی تیٚ هەڵداون و ڕیٚگەیەكی تری گرتووە .

پەندیٚكی ڕووسی هەیە ئەڵیٚ: (لیٚت ناپرسم تۆ كیٚیت، لیٚت ئەپرسم هاوڕیٚكانت كیٚن؟)

كە ئەپرسین، ئەبیستین:

((مەحمورد جەودەت، ئیسماعیل حەقی شاوەیس، عەبدولواحید نووری، عەبدوڵلاٚ گۆران، شیٚخ نووریی شیٚخ ساڵح، فایەق بیٚكەس، عەلی كەمال باپیر[24]، شیٚخ سەلام، میرزا مارف، مەلا حەسەنی قازی، حسن فەهمیی جاف .......هتد) .. ئەمانە دۆستی نزیكی ئەحمەد موختار بوون . ئەمانە لەزۆر ڕووەوە تاقمیٚكی جیاواز بوون، زۆر لایەنی سیاسیو شەخسیو كۆمەلاٚیەتی یان جیاواز بوو، بەلاٚم ڕۆخانەی شیعرو ئەدەبیات و بیر هەموویانی كۆئەكردەوەو هەمووشیان بەپیٚی پیٚ ودانگی ڕۆژی خۆیان یا شۆڕشگیٚڕ یا یاخی بوون . هەریەكەش لایەنیٚكی لە یاخی بوون بەرامبەر بە یاساو بیری كەڕووهەڵهیٚناو گرتبوو و بەچەشنیٚ ڕیٚبازی تایبەتی خۆی ئەو یاخی بوونەی ئەنواند .

هۆنراوەیەكی هەورامی هەیە كەلای هەندیٚك وایە شیعری ئەحمەد موختارە، بەلاٚم من لام وایە شیعری ئەو نی یە، تەنانەت ئەتوانین بە بابەتیٚكی ڕەجەزی دابنیٚینو زۆرتر لەوە ئەچیٚ قسەی سەر زمانی ئەو جەنگاوەرانە بیٚت كە لەگویٚ سیروان لە ئەحمەد موختار كۆبوونەتەوە . لیٚرەدا مەبەستمان لەڕوخسارو پلەی هۆنراوەكە نی یە، بەڵكو ناوەڕۆكەكەی بەڵگەیەكی گەورەمان دەربارەی ئەحمەد موختارو ڕووكردنە چیای ئەداتیٚ:

---

٢٤ كاكەی فەللاح لە زمان عەلی كەمال باپیرەوە ئەگیٚڕیٚتەوەو ئەڵیٚ: عەلی كەمال وتی: كە ئەحمەد بەگ كوژرا تا ١٥ ساڵ ڕیشم نەتاشی .

شازادەی دەوران ئەحمەد موختارەن

پەی ڕۆژی دەعوا ئەسفەندیارەن

هەر پەی وێش خاسەن جە ڕۆژ هەیجا

چەنی دوشمنان بکەرۆ هەیجا

دایم نە خەیاڵ حاڵی کوردانەن

بۆیە ئاراگێل خاکی ئێرانەن

ئومێدش ئێدەن، وە لوولەی تفەنگ

ئیستیقلالمان بگیرۆ وە چەنگ[25]

ئەم چەند دێڕە دەچنە پاڵ چەند بەڵگەیەکی نووسراو (دۆکیومێنت) کە ئێستا لە بەردەستدا نین و کاتێ دەبێ دەست بکەون و بڵاوبکرێنەوە، هەموشیان ئاوات و نەخشەی ئەو ئەحمەد موختارە ئەسەلمێنن کە لەو ڕۆژانەی دوایی ژیانیدا بۆ خێزانەکەیی نووسیوەو لەوێدا بە شەمسە خانی کچی ئەڵێ:

((مەرحەبا شەمسەخان، عاجز نەبی . ئەگەر باوکت ما، بەزۆری خۆی دێتەوە[26])) .

---

٢٥ ئەمە ساڵی ١٩٣٤ نووسراوە کە عێراق بەندی پەیمانی ١٩٣٠ بوو لەگەڵ ئینگلیزداو بەوپەیمانە ئیتیقلالی لەناو چووبوو .

٢٦ لە نامەیەکدا بۆ خێزانەکەی نووسیوەو لای کاک ئەفراسیاب پارێزراوە .

بۆ تەواوکردنی وێنەو دیمەنی شەخسیەتی ئەحمەد موختار ئەبێ باسێکی بە ئینساف لەڕووداو و هەڵوێستی ئەم کەڵە پیاوەی عەشیرەتی جاف بکەین لەڕۆژانی شێخ مەحموودی نەمردا .

هەروەك کۆمەلأنی گەلی کورد لە دەوری شێخی نەمر کۆبوونەوە، شێخ بێ دوژمنیش نەبوو . لە عەشایەر، لە ئەفەندی و خوێندەوار دوژمنی هەبوو . هەندێ لەم دوژمنانە باری سیاسەتو هاتو بردەی لەنێوان تورك و ئینگلیزدا ئەیجوولأندن . هەندێکیشیان کینەی تایبەتی یا هەوای گەورەیی و شانازی عەشایەری و سەر بۆ شێخان شۆڕنەکردن بەرەو دوژمنی و لەناودانی ئەو خەوە خۆشەی ئەو سەردەمەی کوردی دەبردن . کەسی ئەوتۆش هەبوو کە کەمو کووڕی و باری دوواکەوتوویی ڕۆژ سنووری نێوان ڕەخنەو دوژمنی لەبیر بردبوونەوە .

لێرەدا با بێینە سەر هەڵوێستی (ئەحمەد موختار) ی لاو:

عەشیرەتی جاف وەکو پژدەرو هەمەوەندو زۆر عەشیرەتی تری کوردو تەنانەت (سادات) خۆیشیان دوو بەرە بوون . ئەگەر بەپێی باری عەشیرەتی بووایە ئەبوو ئەحمەد موختار لەبەرەی دوژمنەکانی شێخ بووایە . بەلأم دیارە ئەو مەردە هۆشیارە لەو تەمەن و سەردەمەشدا بیری نیشتیمانی زۆر لەلایەنی عەشیرەتگەری یەکەی بەتینتر بووە . لەبەرئەوە لەگەڵ شێخدا بووە، لەناو ئەو بەگزادانەی جافدا بووە کە هاتوون بۆ پیرۆزبایی شێخ[27] . کە شێخ ڕووی کردۆتە شاخ، ئەم لەگەڵیا ڕۆیشتووە .

ساڵی ١٩٥٥ بۆ پرۆژەی ساڵنامەی کوردی بەدوای شوێنەوارەکانی شێخی نەمردا ئەگەڕام . چوومە گوندی (جاسەنە) و وێنەی ئەو ئەشکەوتەم گرت کە شێخ ڕووی تێکردبوو و چاپخانەکەی دەوری حوکمڕانیش لەوێدا ئەگەڕا .

---

٢٧ ڕۆژنامەی ژیان .

پیاوێکی زۆر پیری جاسەنەیی ئەو جێگەیەی پیشاندام لە ئەشکەوتەکەدا، ئەحمەد موختاری تێدا بەند کرد بوو.

بەڵێ، ڕەنگە شێخ لەوە نەگەیشتبێ کە لاوێکی خوێن گەرمی دڵسۆزی وەك ئەحمەد موختار پشت بکاتە کەس و کارە خاوەن شکۆو دەسەڵاتەکانی خۆی و ژیانی ئەشکەوتی لە پاڵ شێخدا لەو هەڵوێستەی ئەوان پێ باشتر بێ . خۆ دووزمان و درۆزن و ڕاپۆرت نووسیش لە هیچ شوێن و زەمانێکدا لە کاری خۆیان نەکەوتوون، لەبەرئەوە هەر لەو ئاوارەیی یەی خۆیدا ئەوی بەندکردووە .

لێرەدا هەڵوێستی نیشتیمانی پتەوی ئەحمەد موختارو باری سەرنجی بەرامبەر بە شێخ و مەسەلەکە دەرئەکەوێ:

سەبا عەرزی خلووسی و بەندەگیم و هەم دوعاخوانی

ببە بۆ خزمەتی شاهی موحتیی گشت سلێمانی

بڵێ قوربانی تۆ بم ئەی سەلاحەدینی ئەیووبی

بەزۆری پەنجە وەك حەیدەر، بە سیما یووسفی سانی

لە دەست کافر نەجاتمان بوو، بیحەمدیللاهی وەلمیننە

لە سایەی دەست و تیغ و هیممەتی تۆ، شێری یەزدانی

کە جورمێکی نی یە تا کەی لە حەبسا دانیشێ قوربان

لە تەنهایی لە فیکری چۆتەوە ئادابی ئینسانی

هەتا مردن وەكو بەندە لەخزمەت شاهی كوردستان

حەياتی خۆی فيدا كا بۆ هەموو ئەمرێكو فەرمانی

من ئەم حەبسەم لەلا فەخرە، بە شەرتێ سەروەری كوردان

لە حەق ئەم بەندەيەی خۆيە بمێنێ لوتفی جارانی

لە لوتفی تۆ زياتر هيچ پەناهێكی نی يە (موختار)

بەكاری هيچ نەهاتن، دۆستەكانی، خزم و خوێشانی

ڕەنگە بووترێ، ئەم بەندێكەو لە بەنديخانەدا داوای بەربوون ئەكات . بەڵێ شێخ زوو بەری داوە، بەڵام هەڵوێستی ئەحمەد موختار بەرامبەر بە شێخی نەمر هەر ئەمە بوو . شاعير تا ساڵی ١٩٣٥ ژياوە . پاش ئەو ماوە كەمەی بەنديخانەی شێخ دەسەڵاتی پەيداكردۆتەوە . هەموو ئەو ڕۆژنامەو چاپەمەنی يانەی لەبەردەستدا بووە كە ئينگليز خواهە كوردەكان گرتبوويان بەدەستەوەو هێرشيان تێدا ئەبردە سەر شێخ .

بەڵام وەك هاوڵاتيەكی بەشەرەف، چ بەنووسينو چ بەقسەو وتنو چ لەڕەفتاری ڕۆژانەدا لە گوڵ كاڵتری بە شێخ نەوتووە . لە ڕۆژانی نوشوستی و بێدەسەڵاتی شێخدا هەر دڵسۆزی بوو . شێخی نەمريش تا دواڕۆژانی ژيانی لەجێی خۆيداو لەكاتی باسكردندا بەسۆزو خۆشەويستی و بەرزی يەوە ناوی ئەحمەد موختاری ئەهێنا .

كەواتە – ئەم هەڵوێستەی شاعير، كە لەباری خێزانیو چينايەتی و بەرژەوەندی شەخسی يەوە نەهاتووە، لەچی يەوە پەيدا بووە ؟

گومان لەوەدا نی یە کە هۆشیاریو خوێندەواری و لێکدانەوە ئەحمەد موختاری بە ڕێگەی شەرەف و مێژوودا بردووە ... بەڕێگەی پیاوەتی و نیشتمانپەروەریدا بردوویەتی .

د. ئیحسان فوئاد لەو چەند دێڕەدا کە بە پێشەکی بۆ چیرۆکی (مەسەلەی ویژدان) نووسیووە باش جێگەی مێژوویی و ئایدۆلۆژی ئەحمەد موختاری دەستنیشان کردووەو نووسیویە:

(ئەحمەد موختار جاف بە ناوەڕۆکی ئەم سەرگوزەشتەیە گیانێکی ئازادیخوازانەو شۆڕشگێڕانەی نیشانداوە . وە بەمە ئەچێتە پاڵی ئە نووسەرانەی هاوچەرخی کە لە مەیدانی ڕەخنەگرتنی تیژی میراتی ڕزیوی دەرەبەگیدا ئەسپی قەڵەمیان چاپوکانەوە تاوداوە، لە نموونەی (عەرەب شەمۆ) چیرۆك نووسی کوردی سۆڤێتی، شاکر فەتاح، عبدالواحید نووری، ئیبراهیم ئەحمەد ....هتد . بەڵکو ئەتوانین بڵێین کە پێشڕەوە بۆ ئەو نووسەرە لاوانەی ئەمڕۆمان کە دەست ئەبەن بۆ ئەم بابەتە گرنگە لە بەرهەمەکانیاندا، چونکە نیوچەرخ لەمەوبەر ئەم پەیامە پیرۆزەی گرتۆتە ئەستۆی خۆی[٢٨]) .

## مەرگی ئەحمەد موختار

ئاشکرایە کە ئەو بیرو هیوایەی ئەحمەد موختار، لە بارێکی تایبەتیدا ماڵو پایەی پێ بەجێ هێشت، کۆمەڵێ چەکداری لەخۆی کۆکردەوەو ڕۆیشت و پاش بەینێك تەرمی خوێناویی هاتەوە .

مامۆستا سوجادی لەم بارەیەوە، نووسیبووی:

---

٢٨ مەسەلەی ویژدان .

**لە تەمەنی بیست ساڵیدا ژنی هێناوە . لە ساڵی ١٩٢٢ بووە بە قایمقامی هەڵەبجە، لە ١٩٢٤ دا بووە بە نائیب لە پەرلەمانی حکوومەتی عێراقیدا، تا لە ١٩٣٥ لە تەمەنی ٣٨ ساڵیدا بە گوللەی تفەنگی دەستێکی پیس لەسەر ئاوی (سیروان) کوژراو جوانە مەرگ بوو، تەرمەکەی برایەوە بۆ هەڵەبجە، لە ئاوایی (عەبابەیلە) لەو گۆڕستانە کە تاهیر بەگی برای تیایا نێژرا بوو ئەمیشیان ناشت[٢٩] .**

**هەرچی مامۆستا ڕەفیق حیلمی یە ئەوە وردتر دەستنیشانی کوشتنی ئەحمەد موختار ئەکاو ئەنووسێ:**

**(لەدوای ژیانێکی ناکامانە، لە ساڵی ١٩٣٤ ی میلادی و لەسەر ئاوی (سیروان–دیالە) لەلایەن دەستێکی نەفامی کوردەوە کوژراوە[٣٠]) .**

**پیرەمێرد کە لە ساڵانی دوایی ژیانی خۆیدا ئەیویست بە هێمنی خزمەت بکا[٣١]، لەو چەند دێڕەدا کە تۆمارمان کردەوە بە چەشنێکی تر تەماشای دوا لاپەڕەی ژیان و مەرگی ئەحمەد موختاری کرد . ئەوەبوو نووسی:**

**(ئیفراتی سەخاو زەکا بوو بووە نەگبەتی سەرشانی، خۆی داناو داخی بە دڵی عالەما نا[٣٢]) .**

---

**٢٩ سوجادی، ل٥٤٥ .**

**٣٠ ڕەفیق حیلمی ل ١٣ .**

**تێبینی: هەر لەم شوێنەدا لە پەراوێزدا نووسراوە: (لە تەئریخی سلێمانیدا ئەڵێ: ١٩٣٣ ی میلادی (مقتولا) وەفاتی کردووە، عەلی کەمال ئەڵێ: لە ١٩٣٥ ، دیارە ئەمی دووایییان ڕاستە .**

**٣١ مامۆستا کاکەی فەللاح باری سەرنجی بۆ ئەوە ڕاکێشام کە گۆران لەو وتارەدا کە بۆ چلەی پیرەمێرد نووسیبوو ئەم چەشنە ڕایەی دەربڕیووە .**

**٣٢ ژیان، ژمارە ٤٣، ساڵی ١٠، ٩ی شوباتی ١٩٣٥ .**

پیرەمێرد هەر لەوێدا دێڕێکی تر بۆ مێژووی مەرگی ئەنووسیٚ و ئەڵیٚ:

دڵ بۆ تەئریخی پەردەی خۆی دڕی

ڕۆحی شیرینی شاعیر، هەڵفڕی[٣٣]

عـەلی کـەمالی بـاپیر ئاغـا لـە هـەمووان بەسـۆزتر بـۆ مـەرگی شـاعیر گریـاوەو نووسیوویەتی:

دیسان فەلەك ئەم داخە چ بوو نای بە جگەردا

ئەم ئاگرە چی بوو لە دڵی عالەمی بەردا

دیسان چی یە ئەم شۆرە لەناو کوردی جیهانا

عالەم هەموو غەرقە لەقوڕو شین و چەمەردا

من دیومە لە خاك دێتەدەریٚ گوڵ بە بەهاران

بۆچی گوڵی من ماتە لەژێری گڵ و بەردا

هەنگامی خەزان فەسڵ و دەمی کۆچی گوڵانە

بەم فەسڵی بەهارە گوڵی من وا لەسەفەردا

ئەو خوسرەوە وا حاتەمی تەی بوو بە سەخاوەت

---

٣٣ هەر ئەویٚ .

ئەم تەئریخە بە ئیملای کۆن بەم چەشنە لیٚ: ئەدرێتەوە:

ڕۆح شیرین شاعر

٢١٤ ٥٧٠ ٥٧١ - ١٣٥٥ .

ئەو ڕۆستەمە وا شێری ژیان بوو لە نەبەردا

سەیری کە چلۆن چەرخی فەلەك دەربەدەری کرد

کوژرا بە غەریبی لە کەژو کێوی (نەوەر)دا[٣٤]

زانیم کە کسووفی ئەبێ ڕۆژی هەموو جافان[٣٥]

من ئەو شەوە گەردوون کە خسووفی بە قەمەر دا

ئەی سەروەری عالی نەسەب، ئەی ئەحمەدی موختار

بۆچ خوێنی شەریفت بە هەوا وا بەهەدەر دا

سەیری کە ئەڵێی خوێنی ڕژاوی گەشی تۆیە

(سیروانی سروشکم کە ئەکا هاژە لە سەردا[٣٦])

هەرچەندە کە ڕۆیشتی بەڵام زیکری جەمیلت

ویردی دەمی کوردانە لە شام و لە سەحەردا

ئەو ناوە بڵندەی کە بەجێت هێشتووە بێ شك

ئەینووسێ موئەڕیخ لە تەواریخی بەشەردا

نابڕێتەوە خوێنت بووەتە خوێنی سیاوەش

---

٣٤ لە پەراوێزدا نووسراوە: (نەوەر) ناوی شاخێکە لە داوێنیدا ئەحمەدموختار کوژراوە .

٣٥ لە پەراوێزدا نووسراوە: دوو ڕۆژ پێش کوژرانی مانگ گیرا .

٣٦ لە پەراوێزدا نووسراوە: ئەم نیوە شیعرەی هینی خوا لێ خۆشبوو تاهیر بەگی برایەتی، بە موناسەبەتی ئەوەوە کە لە کەنار سیروان کوژرا ئەم نیوە شیعرەی هێناوە .

مەنقووش جەمالت لە دڵو فکرو نەزەردا

تەئریخی وەفاتیم لە خیرەد پرسی، وتی پێم

جێی عەدنە ئەوو ئێمەی جیٚ هێشت لە سەقەردا[37]

گۆران هەستی خۆی بەرامبەر بە مەرگی ئەحمەد موختار لە ڕێی بایەخدان بەو دێڕانەی کەماڵی یەوە دەرئەبڕیٚو ئەنووسیٚ:

ئەی کاکە کەمال شاعیری خۆش خوێنی هونەرمەند

بولبول نی یە، تۆی، تەیری تەرەننوم لەسەحەردا

دەك خۆش بیٚ دەم و پەنجەو نووکی قەڵەمی تۆ

بۆ دادیٚ کە دات کاکە لە مەیدانی هونەردا[38]

ئەوەندەش زیاد بکەین کە ئەحمەد موختار لە ٦ی شوباتی ١٩٣٥ دا کوژراوە .

## شیعری ئەحمەد موختار

ڕەفیق حیلمی کە دێتە سەر هەڵسەنگاندنی شیعری ئەحمەد موختار ئەنووسیٚ:

(شیعرەکانی ئاودارو بەتامەو وێنەو شعووری دەروونێکی پڕجۆش و زەمزەمەیە . لەم لایەنەوە لە تاهیر بەگی برا گەورەی ئەچوو کە یەکێکە لە شاعیرە بە سۆزەکانی کورد[39]) .

---

٣٧ بە ئیملای کەمالی (جی عدنە او ایمەیی جی هیشت لە سقردا) ئەکاتە ١٣٥٣ (بڕوانە: دیوانی ئەحمەد موختار جاف، کۆکردنەوەی عەلی کەمال باپیر، سلێمانی ١٩٦٠ ل٥٤) .

٣٨ هەر ئەویٚ، ل ١٦ .

هەروەها لە باری سەرنجی نرخ پێدانی ئەدەبی یەوە نووسیویە:

(بەڕاستیش ئەحمەد بەگ دڵی بە وەتەن (نیشتمان)و زانستی یەوە بوو . لەلایەن پایەی ئەدەبیاتیشەوە ئەم شیعرانەو بە تایبەتی هەندێ لە بەیتەکانی نرخێکی ڕاستی هەیە[٤٠]) .

ڕەفیق حیلمی بەراوردێك لەنێوان شیعری ئەحمەد بەگی ساحێبقران (حەمدی ١٨٧٦-١٩٣٦) و ئەحمەد موختاردا دەکات، لەوێدا شیعری ئەحمەد موختار بەم چەشنە هەڵئەسەنگێنێ:

(شیعرەکانی ئەحمەد بەگی وەسمان پاشایش سادەو ڕەوانەو نموونەیەکی بەنرخی سەلاسەتە[٤١]) .

(هەرچی وەکو ئەحمەد موختار بەگە، وەکو جەنابی ئەمین زەکی بەگ لە تەئریخی سلێمانیدا وتوویە: (سەلیقەیەکی باشی) شیعری بووەو لە سایەی ئەو سەلیقەیەی تەبع و ڕەوانی فیکرەوە شیعرەکانی لە سادەیی و سەلاسەتا پایەیەکی مومتازی هەیە . بەڵام داخەکەم هەردووکیان کە بەهرەیەکی گەورەو بڵندی شاعیری یان بووە لە سەرچاوەی فیتری زەکای خۆیان و موحیتی ئەدەبی سلێمانی بەولاوە، لە هیچ سەرچاوەیەکی عیلم و ئەدەبی بێگانە نەسیبداری فەیزو هونەر نەبوون[٤٢]) .

---

٣٩ ڕەفیق حیلمی ل ١٣ .

٤٠ هەر ئەوێ، ل١٦ .

٤١ هەر ئەوێ ل ٢٢ .

٤٢ هەر ئەوێ ل ٢٢ .

بەڵام سەیر ئەوەیە کە هەر ڕەفیق حیلمی خۆی پێش ئەمە وتبووی: (کوردیو فارسیو تورکیو عەرەبیو کەمێکیش ئینگلیزی ئەزانی[٤٣]) هەروەك لەڕووی بەراوردیشەوە هەر لەو سەرچاوەیەدا نووسیویەتی:

(بەدوور نازانرێ کە لەم بەیتەدا لە فەلسەفەی خەیام ئیلهامی وەرگرتبێ:

بەبێ قەدری بەسەریا ڕامەبوورن، حورمەتی بگرن

گوڵاڵەی سووری ئەم سەحرایە خوێناوی جگەرتانە[٤٤]

مامۆستا عەلائەدین سوجادی کە زۆر مەبەستێتی بۆ هەر شاعیرە هۆیەك بۆ بوونە شاعیر دەست نیشان بکات، خوێندنەوەی شیعر لە کەشکۆڵی مەحموود پاشاوەو شیعری تایەربەگو نالی ئەکات بەهۆی تەقینەوەی شاعیرێتی ئەحمەدموختارو[٤٥] ئەنووسێ:

(کەوابوو ئەحمەد موختار لەم دەورەدا تەنها ناوماڵەکەی خۆیان بوو کتێبی شیعری بۆگرتەوە، چونکە لەوێدا تاهیربەگی تێدا بوو، کتێبخانەکەی تاهیربەگیش دیوانچەی شاعیرەکانی تێدا بوو، سەرەڕای ئەمانەش کەشکۆڵەکە لە بەردەستیا بوو . بەیانیو ئێوارانی فیکری شاعیرانی تیایا وەرئەگرت[٤٦]) .

ئەگەر بەهرەی شاعیرێتی یەکێك بێت لەو پەنهانی یانەی چەند زانستێك تا ئێستا بە چەند جۆر لێکی بدەینەوە ئەبێ ڕەگەزی بەهرەو توانا لای هەموو شاعیرێك دەست نیشان بکەین . لێرەدا مامۆستا سوجادی باش بۆ ئەوە چووە کە دیوانی شاعیرانو

---

٤٣ هەر ئەوێ ل ١٤ .

٤٤ هەر ئەوێ .

٤٥ سوجادی، ل ٥٤٦ .

٤٦ هەر ئەوێ، ل ٥٤٧ .

ئـالودەیی شـیعری ڕۆژهـەلاٚت یـەكێكن لـە كۆڵەكـە پتـەوەكانی شـاعیرێتی ئەحمـەد موختـار . بـەلاٚم توانـا و لێهـاتوویی شـاعیر لەوەدایـە كـە پەیوەنـدی بـەتینی لەگـەڵ سامانی نەتەوەیی و ڕۆژهەلاٚتی شیعردا بەرەو لاسایی و دووبارە كردنەوەی نـەبردووە

هەر بە تاك و تەرا دێڕی ئەوتۆ ئەبینین كە دووبارە كردنەوەی بیر یا وێنـەی شاعیرانی تر بن . ئەحمەدموختار زۆر لە كەرەسەكانی شیعری كلاسیكی هێنـاوە، نـاوو وێنـەو دیمـەنی (مۆم) و (پەروانـە)ش دیـارە، لـە شیعری تەسـەوف باسـی شـێخی سـەنعان و زوننـارو چلچیا وەرئـەگریٚ و لەگـەڵ سـۆفیاندا بـەرەو كێـوی تـوور ئـەڕوا و تەجەللای (نـوور) لـەڕووی دولبـەردا ئـەبینیٚ . بـەلاٚم شـارەزایانە وشـەو وێنـەو دیمـەن تێـك ئەشـكێنیٚ و سـەرلەنویٚ وێنـەی تـازەی شـاعیرانەیان لیٚ دروسـت ئـەكات، كـە هونـەری خۆی و دەنگ و ڕەنگ و بۆی خۆییان پێوە دیارە .

ئەبیٚ كاغەز لەبەرگی گوڵ، قەڵەم جانا لە عەنبەر بیٚ

كە من مەیلم هەیە ئێستا بنووسم وەسفی ڕوخسارت

یا ئەڵیٚ:

وا بەیادی تیغی ئەبرۆی دولبەری بیٚ ڕەحمی خۆی

(ئەحمەد) ی عاشق خەریكە ڕۆحی خۆی قوربان ئەكا

شاعیر ئەیەویٚ دان بەم داشكاندنەوەو دروستكردنەوەیەدا بنیٚ كە ئەڵیٚ:

قافیە هەرچەندە تیكرارە، بەلاٚم (ئەحمەد) بەدڵ

هەر بەیادی تاقی ئەبرۆتە كە جار جار نوێژ ئەكا

بەلاّم کە ئێمە بێین و بەراورد بکەین، ئەبینین شاعیر لەکاروانی بەرەو پێشچوونی شیعری نەتەوەکەی خۆی و ڕۆژهەلاّت دانەبڕاوە، بەڵکو شوێنی خۆی و شوێن پەنجەی لەبەرەو پێش ڕۆیشتنی ئەو کاروانەدا دیارەو ئەنجامیش هەر ئەوەیە کە وێنەکان بە دەنگ و بە خامەی تایبەتی و بە هەنسکی قوولاّیی دڵی ڕاستگۆی ئەحمەد موختار بە زمانێکی تایبەتی شاعیرانەی خۆی داڕێژراونەتەوە .

نالی ئەڵێ:

لە خەوفی تەلعەتت ڕۆژ هەروەکو شێت

بە ڕووزەردی هەلاّت و کەوتە کێوان

ئەحمەد موختار ئەڵێ:

کە دولبەر خۆی نواند خورشیدی خاوەر زوو فیراری کرد

خەجاڵەت ماو بە زەردی عەزمی پشتی کۆهساری کرد

یا بێخود ئەڵێ:

بۆچی نەڕژی سەیلی سروشکم وەکو باران

بۆچی وەکو یەعقووب نەبمە شوهرەیی شاران

ئەحمەدموختار ئەم کەرەسەیە بەم چەشنە دائەڕێژێتەوە، یا پێش ئەو دایڕشتووە، کە ئەڵێ:

فەسڵی ئەو ناسک غەزالە ڕۆیی عوششاقی حەزین

هەر ئەبێ سەیلی سروشکی خوێن لە چاو جاری بکا

سالم ئەڵێ:

زمستان مەیل ئەکەم پایز براکەم

بەهاری عومری من هاوینە بێ تۆ

ئەحمەد موختاریش ئەو چوار فەسڵە کۆئەکاتەوەو ئەڵێ:

دڵم هاوینە بۆ وەسڵی، بەلآم ئەو مەیلی زستانە

خەزانی بۆیە کرد خەڵقینە عومری وەك بەهاری من

وێنەیەك هەیە گەلێك شاعیر دووبارەیان کردۆتەوەو ڕەنگە بە چەند زمان وترابێتەوە بۆ نموونە کەمالی ئەڵێ:

دەستێ بە زامی سینەو دەستێ بە دامەنی تۆ

دەستی ترم لەکوێ بوو خاکێ بکەم بەسەردا

ئەحمەد موختار ئەڵێ:

دەستێ کە بەداوێنی ئەتۆ، دەستێ بەدڵ بم

چی بکەم کە نی یە دەستێ بکەم خاکێ بەسەردا

وێنەو ناوی (حەللاج) بەم چەشنە دەچێتە دێڕی شاعیرەوە کە دەڵێ:

بۆ خەرابیو غارەتی مەعموورەیی دڵ چاوەکەم

تیپی موژگانت بەدایم لەشکری مەنسوورتە

یا هەر دیمەنی شێخی سەنعان بەم چەشنە دێتە شیعریەوە کە ئەڵێ:

شێخی ئیرشادو موریدو سالیكو سۆفی و فەقێ

ئەو بە یەك نواڕین بە جارێ کافرو بێ دین ئەکا

مامۆستا سوجادی سەرسامانە بەرامبەر بە دێڕێکی ئەحمەد موختار دەوەستێت و ئەیباتە جیهانی فەلسەفەوە و دەیکا بە نموونەی بەهرەو بیری شاعیر . ئەوەبوو ڕەفیق حیلمیش لەو دێڕەدا بەراوردی لەگەڵ خەیامدا کرد . بەڵام تۆ بڵێی ئەحمەد موختار لەو بارەیەوە بیستبێتی کە ئەبوو عەلای مەعەڕی وتوویەتی:

صاح هذی قبورنا تملأ الأر
ض فأين القبور من عهد عاد
خفف الوطأ ما أظن أديم ال
أرض الا من هذة الأجساد

خۆ زۆر پاش ئەحمەد موختار بەدر شاکر سەییاب وتوویەتی:

لاتپقلن خگاك فالمبغی (علائی) الادیم
ابناؤك الصرعی تراب تحت نعلك مستباح[47]

بەڵام مامۆستا سوجادی لەسەر حەقە کە بەسەرسامی تەماشای دەربڕینی ئەم بیرە بکات لای ئەحمەد موختار کە مرۆڤ و خاك و نیشتمانپەروەری تێدا تێکەڵ کردووەو ئەڵێ:

بەخۆڕایی لە دەستی بەرمەدەن ئەم خاکە شیرینە

---

٤٧ بدر شاكر سياب، الديوان، دار العوده، بيروت، ١٩٧١، ص ٥١٢ .

که تۆزیٚ وەك جەواهیر سورمەوو کوحلی بەسەرتانە

دیمەنی گەورەی شیعری ئەحمەد موختار ڕاستگۆیی و زۆر لەخۆکردنە . بەڵیٚ بە ئارەزوو و بۆ بەهرەنوواندن بەلای بەلای بەلاغەتگەریدا نەچووە، بەلاٚم کە سنعەتیٚکی سەر بە بەلاغەت خۆی هاتۆتە بەردەست، زۆر بە ڕەوانی شتیٚکی جوانی لیٚ دروست ئەکا . بۆ نموون سەیری ئەم (جیناس)ە بکە:

بە خەتا چووبوو خەتای کرد بەخودا موشکی خەتا

هاتبوو لافی لەگەڵ پەرچەمی تۆدا لیٚ دا

ئەگەر فەلەك و مۆسیقا لە شیعری کلاسیکیدا پیٚکەوە بەسترابن و سەرچاوەشی هەندیٚ فەلسەفەی کۆن بیٚ، ئەوا ئەمیش ئەڵیٚ:

زوهرەوو موشتەری ئیٚستاکە لە خۆشیی چاوت

وەکو سەرخۆش لە سەما کەوتنە ناو ڕەقس و سەما

شاعیر سوورە لەسەر ئەوەی ڕاستگۆیی و ڕەسەنی خۆی لە مەیدانی شیعرو دەربڕیندا هەمیشە دەربخات . بەڵیٚ بە شیعری ڕۆژهەلاٚت و ویٚنەی سووتان و قوربانی و ناوی عاشقاندا دەچیٚتەوە . بەلاٚم ئەنجام هەر شاعیریٚکی کورد و عاشقیٚکی ڕاستەقینە خۆی دەنویٚنیٚ کە شیعر ڕیٚگەی دەربڕین و هەناسەدان و باسی سۆزو سووتانی دڵداری یەکی ڕاستەقینە بیٚت لای:

قەیسی عامیر جیٚگەی وادیی دووجەیل بوو چاوەکەم

خۆ منیش ئیٚستاکە ویٚڵی دەشتەکەی شیٚروانەتم

یا ئەڵێ:

وتم: قوربانی تۆ بم (ئەحمەد) ی بێچارە فەرهادە

وتی: عاشق بە ڕەعنایی منیش زیاتر لە شیرینم

دووربوون لە لاسایی هۆی یەکەمی لادانی ئەحمەدموختارە لە خانەی شیعری کلاسیکی . بەڵام ئەو پێوەندی یە بەتینە لەڕووی شارەزایی و زمان و وێنەوە یەکێکە لە دیمەنەکانی ڕیالیزمی تازە لەشیعری ئەودا ئەنوێنێ . بە چەشنە ئەگەر بابەت و باس و ڕوخساری شیعری ئەو لەیەك جیا بکەینەوە، ئەوا دووبارە کردنەوە و بۆ دیوانی تەواو بەخشین ڕووکردنە هەموو باسێك نابینین . ئەگەر چەند چەشنە باس و بابەتێکیش لەشیعرەکانیدا هەبێ وەك (دڵداری و وەسف و ستایش و هەجوو ....هتد) ئەوە هەر ڕووداو و هەژانی ڕاستەقینە ئەو شیعرانەی پێ وتووە و بۆ ئەوە نەبووە کە وەك هەموو شاعیرانی کلاسیکی لای خۆش بووبێ کە بڵێن (ئەسپی خۆی لە هەموو مەیدانێکدا تاوداوە) .

دڵداری باسی یەکەمی شیعرە . ڕەنگە لای هەندێ شاعیر وانەبێ، بەڵام شیعری ئەحمەد موختاریش هەر لەو جیهانەدایە . ئەگەر جیاوازی یەکیش لەنێوان ئەم و شاعیرانی سەردەمی خۆیدا هەبێ، ئەوا ئەوەیە کە لە شیعرەکانی ئەمدا گڕو کڵپەی عەشقێکی ڕاستەقینە ئەبینین .

لەشیعری کوردیدا هەر لەمەلای جزیری یەوە تا سەر ئەحمەدموختارو لای زۆر شاعیر، جیهانی عەشق لەباتی خۆشی و کامەرانی و بەختیاری هەر جیهانی سووتان و برژان و قوڕپێوان و تیری موژگان و خوێن ڕژانی فەرهادە .

لە پێشەکی دیوانی سەفوەت ..دا باسم لە عەشقێکی ڕاستەقینە کرد، بەڵام نەفرەتم لە چەرخ کرد و نووسیم:

(ئا لەم چەرخەدا شاعیر خۆی نا، تەنانەت منیش هەقی دەربڕینی ئەو پەنهانی یەم نی یەو دەبێ منیش ئەو حیکایەتی عەشقە ببەمە گۆڕەوە[٤٨]) .

بەڵێ بە ئاسانی ئەڵێین (جولێت) ی (ڕۆمیۆ)، (لەیل) ی (مەجنوون)، (شیرین) ی (فەرهاد)و (فاتمە) ی بابەتایەرو سەلمای میرزادەی مەلای جزیری و حەبیبەی ماڵیاوایی نالی . بەلاّم ناوێرین ناوی قژکاڵە، لێوئاڵەکەی گۆڕان و ڕاستی (ست فاتمە) ی هەردی و (..........) ی ئەحمەد موختار بێنین . ئەگەر بمانوێرایە ئەوا کەرەسەیەکی تازەی باسی بەراوردو دەسەلاّتی شاعیرانەمان بۆ پەیدا ئەبوو . لێرەدا ئەبێ ئەگەر لە پەنهانی زانینەوە بێ، یا بەهۆی شیعرەکان خۆیانەوە بێ ئەوە بڵێین کە سۆزی عەشقێکی ڕاستەقینە لە شیعری ئەحمەد موختاردا دیارەو وەسفی جوانی زیاد لە دولبەرێکیش ئاشکرایە:

(ئەحمەد)ی بێچارە بۆ دەردو موسیبەت مایەوە

دولبەری بێ ڕەحمی ئەو سەیرو سەفای بەغداد ئەکا

وەك وتمان ئەحمەدموختار نموونەی پلەی بەرەو پێشچوون و گۆڕانی شیعری کوردی یە . ڕاستە بابەتی نیشتمانپەروەری دەمێك بوو لە چەند دێڕێکی خانی و چەند قەسیدەی حاجی قادری کۆییدا خۆی نوواند بوو . بەلاّم ئەحمەد موختار یەکێکە لەو شاعیرانەی لە پاش جەنگی یەکەمی جیهان بناغەی شیعری نیشتمانپەروەری و سیاسی کوردی یان دامەزراندو شیعری کوردی یان لە مەیدانی سەرژمێردا بەرەو ئەوە برد کە زۆربەی بۆ نیشتمان و نیشتمانپەروەری تەرخان بکرێ . ئەم پلە گۆڕانە لە شیعری ئەحمەد موختار خۆیدا هاوار ئەکات .

---

٤٨ دیوانی سەفوەت، بەغدا، ١٩٨٤، پێشەکی ل١٨ .

شاعیر ئەیووت:

ئەو دەمەی دێن و ئەپرسن لێم مەلائیك مەزهەبم

من بەخوێنی دیدە ئەینووسم لە سینەم ناوی تۆ

بەڵام ئەم وێنەیە لەمەودا بەم چەشنە گۆڕا کە وتی:

مەزهەب و دینی لە قەبرا لێ بپرسن وا ئەڵێت

خاکی کوردستانە (ئەحمەد) مەزهەب و ئیمانەکەی

ڕەنگە هەر لە شیعری ئەحمەد موختاردا ئەو دیاردەیە ببینین کە لەناو قەسیدەیەکی تەواو سەر بە دڵداریدا، لە ناوەڕاستدا یا لە کۆتاییدا دێڕێکی نیشتمانی وەك خورپەی دڵ، بێ گێڕانەوەو خۆڕاگرتن خۆی بنوێنێ . ئەگەر لە دیوانەکەدا بۆ ئەم دێڕانەو شوێنیان لەناو قەسیدەکەدا بگەڕێین ئەم ڕاستی یەمان بۆ دەرئەکەوێ:-

خوێنی چاوی کوردەکانە بۆ وەتەن شیوەن ئەکەن

بۆیە وا لێڵاوو سوورن تانجەڕۆو سیروانەکەی

****

شەشی ئەیلوول ئەزانن ئێوە ئەی قەومی وەفا کردار

ئەوە ڕۆژێ بوو دوژمن قەتڵ و عامی کوردەکانی کرد

****

خوێنی پاکی لاوی کوردانە ڕژاوە کێوو کەژ

بۆیە وا ئێستا کە سوورە ڕەنگی گوڵناری هەیە

****

باوەڕ مەکەن بین بە .... کوردی شارەزوور

بێ ترس ئەڵێم لە ڕاستی دڕاوە کلاوەکەم

ئەم خوریەی لە پڕەو ئەم پلەی گواستنەوەیە زۆر ناخایەنێ کە ئەحمەد موختار خۆی بەرەو مەڵبەندێکی تازە ئەچێت و ئەبێ بە پێشڕەوو بانگی شاعیرانی تریش بەرەو ئەو سەنگەرە تازەیە ئەکات .

شاعیرانی کورد: بەسە، بەس باسی زوڵف و چاو بکەن

کەم خەیاڵی پەرچەم و کاکۆڵی ئاڵۆزاو بکەن

لابدەن کەم باسی سونبول، یا لقی لاولاو بکەن

ئێوە تەدبیرێکی حاڵی قەومی دڵ سووتاو بکەن

زووبەزوو تا ئیش لە دەس دەرنەچوە، سا هەوڵێ بدەن[٤٩]

---

٤٩ زۆر پاش ئەمە قەدری جان لە شامەوە بەهۆی ژمارە ٨ ی ساڵی ٨ی گۆڤاری گەلاوێژەوە نووسیویە:

نیشتمان بریندارە، وەختی ئەفسانە نی یە

لەبەرچاوان سێدارە، وەختی بێگانە نی یە

ئەی جەنابی پیرەمەرد، ساڵدیدەیی گەرم و سەرد

بۆچی تۆ پڕ ئەکەی دەرد؟

وەختی مەیخانە نی یە

ئەی کچە لە چەمچەماڵ، کچە کورد، کچە دەلال

لە حەد زیادە تو مەنال

ئەحمەد موختار پاش ئەمە ئەچێتە ناو جیهانی نیشتمانپەروەری‌و شیعری نیشتمانپەروەری‌و سیاسی یەوەو ئێمەش لەگەڵ خۆیدا ئەباتە ناو ئەو جیهانەو رەگەزەکانی بیری سیاسی ئاشکرای خۆیەوە .

ئەو شاعیرەی لەمەوپێش وتمان بە چیرۆك نووسین‌و زۆر رەفتاری خۆی، پووشکین ئاساو تۆلستۆی ئاسا لە چینەکەی خۆی یاخی بوو، مەیدانی نیشتمانپەروەی بێ رابەر ناهێڵێتەوە، بەڵکو لەناو هەموو چین‌و دەستەی ناو کۆمەڵی کوردەواریدا روو ئەکاتە خوێندەواران‌و بیرڕووناکان‌و ئەوان بە پێشڕەو و چارەسەرکەری دەرمانی گەل ئەزانێ:

کوانێ خەڵقینە لەکوێن فیرقەی مونەووەر تینەتان

چونکە ئەو فیرقە ئەزانن دەردو ئازاری وەتەن

هەر ئەم بیرە سیاسی یە ئاشکرایە وای لێ ئەکات کە شاعیرانە نیشتمانپەروەری‌و مەعاریف پەروەری یەك بخات[٥٠]:

---

وەختی گریانە نی یە

ئەی نالی دیوانی، بۆ ماچێك شەیدانی

تۆ خۆت ئەکەی هەرزانی

وەختی قوربانە نی یە

نیشتمان بریندارە، لە بەرچاوان سەدارە

وەختی عەشقانە نی یە، وەختی مەستانە نی یە

(گەلاوێژ، ژمارە ٩و ١٠ ساڵی ٨، ئەیلول، تشرینی یەکەمی ١٩٤٧، ل٣٥-٣٦) .

٥٠ مەعاریف پەروەری، یا رێبازی رۆشنبیری‌و راپەرین، چەشنە دیاردەیەکە لەشیعرو نووسینی زۆر لەگەلاندا هەیە، جان جاك رۆسۆ نموونەیەکی گەورەیەتی، لای ئێمە لە حاجی قادرەوە دەست پێدەکات‌و زۆر شاعیر یا سەر بەو رێبازە بوون یا دیمەنی ئەو رێبازە لە شیعریاندا دیارە، ئازەری یەکان بەمانە ئەڵێن مەعاریف پەروەر .

بخوێنن چونکە خوێندن بۆ دیفاعی تیغی دوژمنتان

هەموو ئان‌و سەعاتێ عەینی قەڵغان‌و سوپەرتانە

یا:

دەمێکە ئەم وڵاتە وا ئەسیری پەنجەی جەهلە

لە سایەی عیلمەوە ئیمڕۆ ئیتر نۆبەی زەفەرتانە

ڕۆژنامەو چاپخانە لای ئەم شاعیرە بیر ڕووناکە زانست پەروەرە، هۆی گەورەی پێشکەوتنن و بۆ گۆڤاری (بانگی کوردستان) ئەنووسێ:

باعیسی پێشکەوتنی ئەم قەومەیە ئەو مەتبەعە

ئەلحەق ئەمڕۆ خاکی کوردستانی زێبا کردەوە

شاعیر هەندێ جار لەم مەیدانەدا پێی لێ هەڵئەبڕێ‌و ئەڵێ:

غەیری مەکتەب بۆ تەداویی ئێمە هیچ دەرمان نی یە

هیچ سیلاح چاتر لەعیلم‌و سنعەت‌و عیرفان نی یە

بەڵام وەك وتمان بیرێکی سیاسی ئاشکرای هەیەو بیرەکە هەر ئەوە نی یە کە کورد لە چوارچێوەی ئەم زانست پەروەری یەدا ڕابگرێ.

لەخەو هەستن درەنگە میللەتی کورد خەو زەرەرتانە

هەموو تەئریخی عالەم شاهیدی فەزڵ‌و هونەرتانە

دەسا تێکۆشن ئەی قەومی نەجیبی بێکەس‌و مەزڵووم

بەگورجی بیبڕن ئەو ڕێگە دووره وا لەبەرتانە

شاعیر بە ئاشکرا ڕێگەی ئەو لەخەوهەستان و تێکۆشانەو مەبەست و ئەنجامی دەست نیشان ئەکات:

پاش قڕانی مودەعی دەس پێ ئەکەن تەعمیری موڵك

ڕێگەی ئاسن ئەچێتە خاکی هەورامانەوە

ئەحمـەدموختار هۆشـیارانە پەنجـە بـۆ یـاری و درۆی دەوڵەتـە ئیمپریـالی یـەکان درێژئەکا و ئەڵێ:

ئەم قەراری عوسبەیە خەڵقی ئەڵێن بۆ کورد ئەبێ

هەر قسەی ڕووتە و قسەش ناچێتە ناو گیرفانەوە

کە بەدیوانی ئەحمەدموختاردا دەچینەوە، وەك زۆر دیـوانی تـری شـاعیرانی پێشـوو وشەی (مەخابن) بۆ ئەوە تۆمار ئەکەین کە مێژووی نووسینی زۆربەی شیعرەکانی، یـا پـاش و پێشـیان دیـار نـین . لەبەرئـەوە لـەو تەمەنـە کورتـەی ئەویشـدا جەمسـەری گـۆڕین و پـاش و پێشـی بیرمـان لـە دەسـت ئەچـێ . بـەلام لەگـەڵ ئەوەشـدا هـەر ئـەبێ پەنجە بۆ هەندێ بیری شاعیر درێژ بکەین .

شـاعیر زۆرجـار لەسـەر پێـڕەوی شـیعری کلاسـیکی زەمـی ڕۆژگـارو دەوران ئـەکات . بەلام زیاتر ئەم زەمە بەرەو بیری هەندێ لە شاعیرانی ئەم سەردەمەی ڕۆژئـاوا ئـەبات و داوای خۆش ڕابواردن و فرسەت لە کیس نەدان ئەکات:

ئەبلە وا دایم لە عەیش و شادمانی و عیزەتا

ئەهلی عیرفان و کەمال ئێستاکە زاری و شین ئەکا

دوژمنه چەرخی فەلەك، بۆ پیاوی ساحێب عەقڵ و هۆش

ڕووی کەرەم دایم لە هەرزەو شێت و بێ تەمکین ئەکا

یا ئەڵێ:

زەمانە چونکە خۆی ئەسڵەن بەقای بۆ کەس نی یە تاسەر

تەماشا کەن هەمیشە بۆ کەسانی بێ وەفا چاکە

لە وەزعی چەرخی دوون پەروەر مەبە تۆ عاجز ئەی (ئەحمەد)

کە چەند ڕۆژێ لە بۆ ئەشخاسی سوفلەو بێ حەیا چاکە

یا ئەڵێ:

ڕەفیق هیچ غەم مەخۆ خۆش ڕابوێرە فرسەتە ئێستە

بزانە تۆ لەدنیادا لە بۆ چەند ڕۆژێ میوانی

هەر ئەمە تاوێك لەو لەو عەشقە ڕۆمانتیکی یەی خۆی دوور ئەخاتەوەو ئەڵێ:

دوڕسمین و، مووشکافی تۆ ئەگەر نازانی خۆت

ئەحمەدی خاڵۆت هەمیشە پیشەی ئوستادی یە

هەندێ جار شاعیر لەم ژیان و جیهانە ورد ئەبێتەوەو ئەنووسێ:

بەڵێ بازاڕی دەهرە، وا یەکێ سۆفی، یەکێ شێخە

یەکێ جێگەی خەراباتە، یەکێ بێ هۆشی تریاکە

ئەحمەد موختار سەر بەتەسەوف نەبووە، بەڵام کەرەسەی شیعری سۆفیان زۆر جار چۆتە ناو شیعری یەوە . ئەوەبوو باسی شێخی سەنعان و چلیپا و زوننارمان کردو دیمان لەکیۆی تـوور (نەعلەین) یا کەوشەکانی دائەکەنیّ و چاوەڕێی تەجەللای دولبەرە .

کە هەر لەسەر پێڕەوی شاعیرانی سۆفی وەك مەحوی و شێخ ڕەزاش ڕقی هەڵئەسیّ، دیوی ئەودیوی شیعری سۆفی دووبارە ئەکاتەوە و ئەڵیّ:

وشکە سۆفی هاتبوو ئەیووت بەهەشت هەر بۆ منە

ڕیشی خۆی جووڵان وەکو سابرێن کە شەو کاوێژ ئەکا

کەی خوا توججارە، خوا گەورەو غەفوورو عادلە

چۆن لەگەڵ عەبدا حیسابی قەرزی ڕۆژوو و نوێژ ئەکا

## زمان لە بەرهەمی شاعیردا:

مامۆستا سوجادی کە لا بەلای زمانی شیعرەکانی ئەحمەدموختاردا ئەکاتەوە، لە سەرەتا و تێکەڵی زمانەکەی ئەدویّ . یا بڵێین لەو ماوەیە ئەدویّ کە زمانی شیعری ئەو سەر بەزمانی شیعری کلاسیکی بووەو پاش ئەوە لە گۆڕانی ئەو زمانە ئەدویّ و ئەڵیّ:

(ئەکەوێتە سەرئەوە کە زمانی کوردی زمانێکی ئەدەبی یەو بە هەموو جۆر ماوەی ئەوەی هەیە کە خزمەت بکریّ و لە وشەی بێگانەدوور بخرێتەوە، دێنیّ ئەم ڕێچکەیە ئەشکێنیّ و بەو نیازە دەست ئەکا بە وتنی شیعری کوردی پەتی، کە ئەمە بۆ ئەو

سەردەمە نیشانەی گیانێکی پاك‌و هەستێکی بەرز لەودا دەرئەخاو قەومیەتێکی خاوێن بە ئاشکرا ئەنوێنێ"[51] .

بەڵێ زمانی شیعری کوردی بە سێ پلەدا ڕابورد:

١- پلەی کلاسیکی‌و تێکەڵی شیعر لە وشەو موفرەدات لەڕووی زمانەوە .

٢- پلەی شیعری ڕۆمانتێکی‌و نزیکی زمانەکەو وشەکانی لە زمانی شیعری عوسمانی یەوە .

٣- پلەی کوردی پەتی .

هەرچەندە زۆربەی شیعری ئەحمەد موختار سەر بە پلەی یەکەمن، بەلاّم لەو پلەیەشدا زۆر لە خۆکردن‌و بەدوای وشەدا گەڕان نابینین، بەڵکو ئەو وشانە بەهۆی خوێندنەوەو شیعری کلاسیکی ڕۆژهەلاّتەوە چوونەتە ناو دەروونی شاعیرەوەو بە ڕەوانی‌و ئاسایی‌و بێ زۆر لەخۆکردن دەرپەڕیونەتەوە .

ئەحمەد موختار شاعیری پلەو تەمەنی عەبدوڵلاّ گۆرانە، شاعیری ئەو سەردەمەیە کە پیرەمێرد لە ئەستەمبووڵ هاتبووەوەو دەستی دابووە شیعر نووسین . ئەگەر ئەو بزوتنەوەی کوردی پەتی یەی، بەناوی پیرەمێردو گۆرانەوە تۆمار ئەکرێ و شاعیرانی ساڵانی چل‌و پەنجا لەوەدوا هەر ئەوەیان کرد بە زمانی شیعری خۆیان لەلای شاعیرانی تری وەك (حەمدی‌و زێوەرو کەمالی‌و سەلام‌و بێکەس ....هتد) جێگەی خۆی نەگرتبێ، ئەوا ئەحمەد موختار هەر لەسەرەتای گواستنەوەی گۆرانەوە لە پلەی دووەمی ئەم دابەشکردنەوە بۆ پلەی سێ یەم، یا ڕەنگە پێش ئەوە، لە پلەی یەکەمەوە یەکسەر ئەچێتە سەر پلەی سێ یەم‌و لەمەشدا پێشڕەوییەك بۆ خۆی

---

٥١ سوجادی، ل ٥٥٣-٥٥٤ .

تۆمار ئەکات لەو دەستنووسەدا کە بە خەتی شاعیر خۆی ماوە، هەر بەخەتی خۆی لای هەندێ قەسیدە دەست نیشانی ئەوەی کردووە کە ئەمانە بەکوردی پەتی نووسراونو وشەی زمانی تریان تێدا نی یە .

بەداخەوە وەك وتمان - مێژووی نووسینی هەموو شیعرەکان دیار نین - تا بەدڵنیایی یەوە بڵێین ئەحمەد موختاریش وەك پیرەمێردو گۆران هاتە سەر کوردیی پەتیو نەگەڕایەوە سەر ئەو زمانە تێکەڵە . بەلاّم ئەم چەند قەسیدە کوردی یە پەتی یەو ئەو نیشانەیەی خۆی، ئەوەندەمان بۆ دەرئەخەن کە ئەم شاعیرە بە دیمەنەشمان هەر لە سەرەتای پەیدابوون و گواستنەوەی زمانی شیعرەوە دەستی لە دانانی تەلاری ئەم زمانە تازەیەی شیعری کوردیدا هەبووەو لەگەڵ (گۆرانو پیرەمێرد) دا بووەو وەك هەندێ شاعیری دیاری تری سەردەمی خۆی پشتی تێ نەکردووە . بەمەش هەر جێگەی خۆی لەکاروانی مێژوو و پێشکەوتندا بە ئاشکرا دەست نیشان ئەکات .

ئەوەندەش لەم تێبینی یە زیاد ئەکرێ کە ئەحمەد موختار بەو زمانە تێکەڵە زیاتر غەزەلی بچووکی وتووە، کەچی بەم کوردی یە پەتی یە قەسیدەی درێژی هەیە . هەر ئەم لێ زیادکردنە بەجۆرێکی تریش ئەوترێت . ئەویش ئەوەیە کە شیعری دڵداریی ئەحمەدموختار ئەچێتە قاڵبی غەزەلی بچووکەوە، بەلاّم زۆر لە شیعرە نیشتمانیەکانی قەسیدەی درێژن . ئەتوانین بڵێین لەوی یەکەمدا تەجروبەکە یا بیرو سۆزەکە خەست کراوەتەوەو لە غەزەلێکی چەند دێڕیدا داڕێژراوە . بەلاّم ئەمیان کە هەموو خاكو مرۆڤو مەسەلە ئەگرێتەوە، بەو خوێن گەرمیەی شاعیر ئاودراوەو مەودای پانو بەرینی چەند قەسیدەی ویستووە . یا ئەتوانین بە ئیستیلاحی ڕەخنەگرە کۆنەکان بڵێین لە باسی دڵداریدا هەناسەی کورتە، بەلاّم کە دێتە مەیدانی نیشتمانپەروەری یەوە نەفەسێکی درێژی هەیە . بێ ئەوەی لەمەی دواییدا ئەو هەناسە درێژە پلەی بەرزی شیعرەکانی هێنابێتە خوارەوە . لێرەدا ڕەنگە بڵێم ناوەڕۆكو ڕوخسار، واتە

نیشتمانپەروەری و کوردی پەتی بەچەشنێك ئەچن بەناویەکدا کە شیعری جوان‌و ڕەسەنی تازە دەهێننە کایەوە .

## بەرهەمی ئەحمەد موختار

وەك لە چەند شوێندا باسکراوە . ئەحمەدموختار تا بلاوبوونەوەی (مەسەلەی ویژدان) لە ساڵی ۱۹۷۰ دا، هەر بە شاعیر ناسرا بوو بە سۆزو ڕاستگۆیی‌و خوێن گەرمی شیعرە نیشتمانیەکانی گوێی چەند نەوەو پشت ئەزرنگایەوەو ئەو شیعرانەی لەبەر ئەکران‌و ئەوترانەوە . کە ئەو چیرۆکە چاپکرا ناوی ئەحمەد موختاری لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا بە تاقە چیرۆکێك بردە ڕیزی سەرئامەدانی چیرۆکی کوردی‌و ڕێبازی ڕیالیزمی ڕەخنەگریی کوردی یەوە .

باسی ئەم دیوانەو شیعرەکانی لەمەودوا ئەکەین . هەرچی پەخشان‌و چیرۆکە، ئەوە بلاوکردنەوەی ئەو دەستنووسە ناتەواوەی (مەسەلەی ویژدان) ئاشکرایە . بەلام لە چەند شوێن باسی ئەوەش هەیە کە ئەحمەد موختار لە پاڵ (مەسەلەی ویژدان) دا دوو چیرۆك یا دوو ڕۆمانی تری هەبێ .

مامۆستا شاکر فەتاح لە باسی گەشتێکدا کە ساڵی ۱۹۳۳ بۆ هەڵەبجەو هەورامانی کردووە[52] ئەنووسێ:

(کە گەڕاینەوە ماڵی پاشا، (ئەحمەد بەگ) لە دیوەخانەکەیدا دانیشتبوو . زۆر گیان سووك‌و ڕووخۆشم هاتە پێش چاو . باسی وێژەی کوردیم لەگەڵ کردەوە . لە کۆمەڵە هۆنراوەکانی خۆی گەلێکی بۆ خوێندینەوە . قسەکانی ئاودارو ناسك بوون . باسی دڵداری‌و نیشتمانپەروەری یەکی یەجگار بەهێزی ئەکرد . بەڕاستی خۆشخوانی

---

٥٢ مامۆستا شاکر فەتاح لەم نامیلکەیەدا وەسفێکی جوان‌و باسی ماڵی پاشاو ژیانی ڕۆژانەی ئەو سەردەمە کردووە کە بەڕاستی بۆ باسی فراوانی ژیانی ئەحمەد موختار دەست ئەدات .

یەکانی لە چێشکەدا لە هۆنراوەکانی (گاهر بەگ) ی برای کەمتر نەبوون . (ئەحمەد بەگ) نیازی هەبوو لە چاپیان بدات . بێجگە لەوە ئەیگوت:

(چیرۆکێکی کاریگەری قوڕبەسەریی کوردم نووسیوەتەوە . نارەسەنی بێگانە پیشان ئەدات . چاوی کورد ئەکاتەوە . ئەی گوت: (گوێ نادەمە دڵ و ئارەزووی میری . قسەی سەربەستی ڕاستی خۆم هەر ئەکەم . بەوانەوە نەبێ لە چاپی نادەم) . گوتی: (شتێکی تریشم بەدەستەوەیە . ڕەنگە ئەم زستانە تەواوی بکەم[٥٣]) . وەك دەرئەکەوێ ئەحمەد موختار لێرەدا باسی (مەسەلەی ویژدان) ناکات، بەڵکو باسی دوو چیرۆکی تر ئەکات .

لە ساڵی ١٩٨٤ دا لەگەڵ کاك ئەفراسیابدا چووینە هەڵەبجە . سۆراخی ئەم چیرۆکانەشمان کرد . حیلمی شاعیر (محمدی شێخ حسین) مابوو . کوێر بوو بوو . ناوەڕۆکی ئەم چیرۆکانەی دەزانی و ناوی ئەنان (ڕۆمان) . بەدڵنیاییەوە ئەیووت: دەستنووسیان لای من بووە و ئێستا لای کوڕەکەمە . لەو سەفەرەدا کوڕەکەیمان نەدی . تائێستاش سۆراخکردنی کاك ئەفراسیاب و من نەگەیشتە مەبەست . هیوامان وایە ئەمانەش وەك (مەسەلەی ویژدان) مابن و لای کەسێکی بەویژدان بن . بەهەر ڕێگەیەکدا بێت، بیانگەیەنێتە گەلی کورد .

---

٥٣ شاکر فەتاح، گەشتی هەڵەبجەو هەورامان لە ساڵی ١٩٣٣ دا، سلێمانی، ١٩٧٣، ل١٧ .

تێبینی: مامۆستا شاکر فەتاح لە بینینێکدا ئەم قسانەی دووبارە کردەوەو وتی: ئەحمەد بەگ ئەیووت: حکوومەت بیەڵێ و نەیەڵێ من هەر چاپی ئەکەم .

# ئەم دیوانە

سەرەتا کاك مەحموود زامدار ساڵی ١٩٧٤ چەند قەسیدەی ئەحمەد موختاری لە گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ) دا بە کۆمەڵێ بەراوردەوە بڵاوکردبۆوە . دیار بوو پاش ئەوە سەودایە خستبوویە سەر کۆکردنەوەی هەموو دیوانی شاعیر . لە ساڵی ١٩٨٢ دا داوای لێ کردم کە ئیزنی کۆکردنەوەو بە چاپ گەیاندنی هەموو دیوانی شاعیری لە کاك ئەفراسیابی کوڕە گەورەی شاعیر بۆ وەرگرم . بە یەکم ناساندن، کاك ئەفراسیاب لە پاڵ ئیزن دانا ئامادەیی خۆی بۆ هەموو یارمەتی یەك پیشان ئەدا . هانی کاك زامدارم دا بۆ کەوتنە ئیش . لەو ماوەیەدا کە ئەو خەریك بوو، کاك ئەفراسیاب لە چوونێکی بۆ سلێمانی (کاك ئومێد کاکەڕەش)ی دیبوو و وەك دەرکەوت ئەویش دەمێك بوو بە دیوانی ئەحمەدموختارەوە خەریك بوو بە حیسابی خۆی کارەکەی گەیاندبووە ئەنجام و هەمووی بە کۆکراوەیی داینێ .

بەرامبەر بە بوونی دوو نوسخە . (ئەوەی زامدار کە هێشتا وەرنەگیرابووو ئەوەی ئومێد کە وەرگیرا بوو)، کاك ئەفراسیاب بڕیاری ئەوەی دا کە من سەرەوکاریی دیوانەکە بکەم، بەتایبەتی کە لە هەندێ لاوە ئەمانبیست کە چەند کەسی تر بەم ئیشەوە خەریکن . پاش ئەو بڕیارە کاك زامدارو کاك ئومێدم دی و ئەمان بەم ئەنجامە ڕازی بوون . لەگەڵ ئەوەشدا کاك ئەفراسیاب بانگەوازێکی لە (هاوکاری)و (بەیان) دا بڵاوکردەوەو داوای ئەوەی کرد کە هەموو لا یارمەتیمان بدەن . پاش ئەوە کاك عوسمان هەورامی لە هاوینی ١٩٨٤ دا هاتە لام و باسی ئەوەی بۆ کردم کە ئەو زۆر شیعری ئەحمەد موختاری لابووەو داوێتی بە کاك ئومێدو خۆی کارێکی زۆری لەم مەیدانەدا کردووە . پەیمانی دا کە ئەویش ئەنجامی ئەو کارەمان بداتێ . بەڵام بەداخەوە تا تەواوکردنی ئەم ئیشەی ئێمە هیچ دیار نەبوو .

بەهۆی بانگەوازەکەوەو بە کۆششی کاك ئەفراسیاب دەستخەتێکی تازەمان لە هەڵەبجە دەستکەوت . هەروەها مامۆستای قوتابخانەی (دێی ئەلی) لە دەوری سلێمانی کاك جەمال عەزیز ساڵح دەستنووسێکی دیوانی ئەحمەد موختاری دایێ کە بە خەتی مامۆستا نەجمەدین مەلا نووسراوەتەوە . هەروەك بەدەم کارکردنەوە لە بەراوردکردنی نوسخەکان و لێکدانەوەی وشەکانیدا لە کتێبخانەی گشتی سلێمانی بە یارمەتی کاك یاسین بەرزنجی خوشکەزام بەرۆژنامە کۆنەکاندا گەڕاینەوەو هەندێ شیعرمان دەستکەوت کە لەو نوسخانەی تردا نەبوون .

بەم جۆرە ئیتر کارەکە ئەوەندە چاوەڕوانی پێویست نەدەکرد، دەستم دایە بەراوردی ئەو نوسخانەو ئامادەکردنی ئەم پاچە .

وەسفێکی نوسخە دەستنووس و چاپکراوەکان :

١- ئەو دەستنووسەی لە پەراوێزدا ناومان نا (خۆی):

ئەم دەستنووسەمان پاش بلاوکردنەوەی ئەو بانگەوازە لە هەڵەبجە دەستکەوت . دەستنووسەکە لەناو دەفتەرێکی مام ناوەندی خەت خەتی ئینگلیزیدا نووسراوەتەوە . (٦٨) غەزەل و دوو چوارینی تێدایە . بەشێکی بە خەتی شاعیر خۆیەتی یا بە مەرکەبێکی مۆر یا بە قەڵەمی قۆپیە نووسراوەتەوە . بەشێکی تری بە مەرەکەبی ڕەشی چینی بەخەتی عەلی کەمالی باپیر ئاغا (کەمالی) نووسراوەتەوە . بەلام کە لەهەندێ شوێندا کەمالی وشەی گۆڕیوە، شاعیر بە خەتی خۆی وشەکەی خستۆتە جێی خۆی . چەند پارچەیەکیشی بە خەتێکی ترە .

٢- ئەو نوسخەیە بوو کە ووتمان کاك جەمال عەزیز ساڵح کە شایانی سوپاسێکی بێ پایانە پێشکەشی کردین و بە خەتی مامۆستا نەجمەدین مەلا نووسراوەتەوە .

دەستنووسەکە کە یەکێکە لەو دەستنووسانەی دیوانی شاعیر کە لەلایەن مامۆستا نەجمەدین مەلاوە نووسراونەتەوە . چونکە وەکو ئەزانین مامۆستا لە پاڵ دەرس وتنەوەدا خەریکی کارێکی وەکو کاری (نەسساخ)ە کۆنەکانیش بووە، دیوان و کەشکۆڵی بۆ هەندێ کەس ئەنووسی یەوە، ناواخنی ئەم دیوان و کەشکۆڵانەش زۆربەی بە کۆششی خۆی کۆکرابوونەوە، یان دەست خرابوون .

ئەم دەستنووسەیان بریتی یە لە ١١٢ لاپەڕەی مام ناوەندی و بە مەرەکەبی ڕەشی چینی نووسراوەتەوە .

(٩٢) پارچە شیعری تێدایە کە لە سەرووی هەریەکەیانەوە تیپی (غ) ی نووسیوەو ژمارەیەکی لاوە داناوە . واتە غەزەلی ژمارە ئەوەندە .

بەداخەوە ئەو بەشەی دەستنووسەکە کە کاک جمال داینیێ لە لاپەڕە (٤٣) و غەزەلی (٤٢) هەمەوە دەست پێدەکات پەیمانی داینیێ کە بەشی یەکەمیمان بۆ بدۆزێتەوە . بەلاّم دیاربوو کە نەدۆزراوەتەوە . وەکو بۆی گێڕاینەوە کاتی خۆی مامۆستا نەجمەدین مەلا ئەم دیوانەی داوە بە کاک (عەلی عەزیز سالّح) ی ئەندازیار کە برای کاک جەمالەو ئێستا لە دەرەوەی ولاّتە . نووسەرەوە لە دووا لاپەڕەدا نوسیویە:

(بە یاریدەی خوا دیوانی شاعیری بەناوبانگ احمد مختار بگ تەواو بوو لە شەوی ٢ی کانونی یەکەم ساڵی ١٩٤٧م لە مرکزی قچای ڕانیە بە قلم مامۆستا نجم الدین ملا) .

ناوەکەی خۆی دووبارە کردۆتەوەو ئیمزاشی کردووە . ئەم نوسخەیە لە پاش ئەوەی یەکەم پشتی پێ بەسترا . لە پەراوێزدا ناونرا (نج) .

٣- نوسخەکەی کاک ئومێد کاکەڕەش کە لەسەرەتادا بڕبڕەی پشتی ئیشەکەمان بوو . بەڕاستی کاک ئومێد هەوڵێکی زۆرو مەردانەی داوە . تێکرا بە قەسیدەی (شازادەی

دەوران) ەوە (١٠٠) پارچە شیعری ئەحمەدموختاری نووسیوەتەوە . سەرچاوەی کۆکردنەوەو نووسینەوەی کەشکۆڵێکی کاك ئەنوەر ڕەحیمی ئامۆزای بووە کە ساڵی ١٩٦١ کەوتووەتە لای و ٨٠ پارچە هۆنراوەی شاعیری تێدا بووە . هەروەك کەشکۆڵێکی مامۆستا نەجمەدین مەلاشی دەستکەوتووە کە (٣٧) پارچە هۆنراوەی تێدا بووە کە زۆربەیان لای خۆی هەبوون.

کاك ئومێد لە پەراوێزدا ئیشارەتی جیاوازی شیعرەکانی لای خۆیو دوو دیوانە چاپکراوەکەو نووسینەوەکەی مەحموود زامداری کردووە .

ئەم نوسخەیەمان لە پەراوێزدا ناوناوە (ئو) .

٤- نوسخەکەی کاك مەحموود زامدار کە ئەمیان پێش بینینو وەرگرتنی هاندەری کاك ئەفراسیاب و من بوو بۆ چوونە مەیدانی ئەم کارەوەو، یەکەم سوپاسیش لەم ڕووەوە هەر بۆ کاك زامدارە .

ئەم دەستنووسە ٨٧ پارچە هۆنراوەی شاعیری تێدا بوو لەگەڵ پارچەی (شازادەی دەوران) و تەخمیسەکەی شاهۆ .

ئەم نوسخەیە لە ئیشکردنا کەمێك ماندووی کردم، چونکە بۆ دۆزینەوەی هەموو پارچەو دێڕێك ئەبوو لاپەڕەی هەموو دەفتەرەکەی هەڵدەمەوە . قەسیدەکانی لە سەرچاوەکانەوە وەرگرتووە . بەڵام چەند قەسیدەیەك نەبێ ئیشارەتی سەرچاوەی ئەوانی تری نەکردووە . تەنانەت بەپێی تیپی دوایی قەسیدەش نەنووسراوەتەوە . سەرفراز بێ، بایەخێکی گەورەی نوسخەکەی لەوەدایە کە نامەیەکی لەگەڵدا بۆ ناردووم و ئەڵێ:

(چاوەکەم .. بەر لە دە ساڵو دەق لە ڕۆژی ١٩٧٤/٥/١١ دا دەسم کرد بە بلاْوکردنەوەی (١٩) پارچە شیعری تازەی ئەحمەدی موختارو (٤) یشم لەبەر ئەو

دەسنووسـەی کـە دەسـتم کـەوتبوو ڕاسـت و ڕێـكو کـۆكو سـاغ کـردەوە . تێکـڕای گەیشــتە (٢٣) قەسـیدەی تـەواو . لـە هـەمان کاتیشـا پێشـەکی یـەکی وردم بـۆ نووسیبوو، لە ئەنجامیشا هەموو ئەو شیعرانەی لە چاپەکەی مامە گیودا بڵاوکرابۆوە، لەبەر دەستنووسەکە یەکە یەکە تەتەڵەو بژارم کردبوو . بۆیە تکا ئەکەم گەر پێت کرا بەوردی سەیری ژمارەکانی (١٧-١٨-١٩) ی (ڕۆشنبیری نوێ)ی ئەو ساڵە بکە . لام وایە ئەگەیتە چەند ئەنجامێكو لەوانەیش کەس بە ڕای من ئەو دەسپێشخەریەی نەکردووەو کەسیش بەراوردی ووردی شیعرەکانی چاپ و دەسنووسەکەی نەکردووە .

ئەمەیان وا (٢) پارچە شیعر کە یەکێکیان پێنج خشتەکی یەکە لە کەشکۆڵی مامۆستا (حەمەبۆر) لە تەك تاکە شیوەننامەیەکی عەلی کەمالو یەکێکی کەی پیرەمێردم وەرگرتووە . لە پاڵ قەسیدەیەکی کەی کە لە پەخشنامەی (سلێمانی) ی ساڵی (١٩٦٩) دەرم کردووە .

بەمەیش تێکڕا هەوڵەکەم ئەبێ بە (٢٥) پارچە شیعرو دوو شیوەننامەو پێنج خشتەکی یەك، سەرباری گەڕان و سووڕانم بەنێو (بانگی حەق) و (ڕۆژی کوردستان) و (ژیانەوە)و (ژین)و (کوهستان)و (سلێمانی)و گۆڤاری (کۆلێجی ئەدەبیات) دا .

مەحموود زامدار لە پاڵ ئەم نووسینەدا لەناوەوە ئیشارەتی ئەوەی کردووە کە ئەو کەشکۆڵە ناوی (مینای شکستە) یەو بەخەتی مامۆستا نەجمەدین مەلا نووسراوەتەوەو ئەم بەرگی (١،٣) ی لای کاك حەمەبۆر دیوە . هەروەك قەسیدەیەکیشی لە (بەیازی شەنگ)ی حەمەبۆرەوە وەرگرتووە . چەند دێڕێکی تاکیشی تیایە، کە بەشی قەسیدەی ترەو لە دیوانەکەدا هەبوون .

بێگومان بۆ بەراوردو ڕاستکردنەوە سوود لەم نوسخەیەش بینرا کە لە پەراوێزدا (ز) مان ناونا .

٥- دیوانه چاپکراوەکەی کە ساڵی ١٩٦٠ لەلایەن عەلی کەمال باپیرەوە چاپکراوە . ئەم دیوانە تەنیا ٣٠ قەسیدەی شاعیری تێدایە . دیارە ئەم سێ قەسیدەیە بەلای کەمالی یەوە هەڵبژاردەی شیعری ئەحمەد موختار بوون .

عەلی کەمال دەستکاریی هەندێ شوێنی شیعرەکانی کردووە کە دیارە بەلای خۆیەوە بەو چەشنە باشتر بووە . لەپەراوێزدا ئیشارەتمان بۆ ئەو دەسکاری یانەی کەمالی کردووە . بە مەبەستی ئەوەی بەراوردی پێڕەوی هەردوو شاعیر بکەین .

ئەم نوسخەیەمان لە پەراوێزدا ناوناوە (ع)

٦- چاپەکەی مامۆستا گیوی موکریانی کە ٨٠ لاپەڕەیەو (٦٦) پارچە شیعری تێدایە، ٣٠ پارچەکەی چاپی پێشووی تێدا دووبارە کراوەتەوە . لە پەراوێزدا ئیشارەتی ئەو جیاوازی یانەشمان کردووە کە لەنێوان ئەم چاپەو دەستنووسەکاندایە ئەم نوسخەیە لە پەراوێزدا ناونراوە (گ)

# پێڕەوی ئامادەکردن

وەك وتمان، بە مەبەستی ئامادەکردنی پوختەیەکی نزیك لەوەوە کە ئەبێ شاعیر بەو جۆرەی نوسیبێ، بەو چەشنەی باس کرا، نوسخە دەستنووس و چاپکراوەکانمان داناو قەسیدەکانمان بەو چەشنە لە ڕاستترین سەرچاوەوە (بەلای خۆمانەوە) وەرگرت و هەر لەتێکستی قەسیدەکەدا ژمارەمان بۆ پەراوێز لای ئەو وشەو دێڕانە دانا کە لە نوسخەی تردا جیاوازی یان تێدایە . بەم ڕەنگە پەراوێزەکانمان لەژێر هەموو پارچە هۆنراوەیەکدا کرد بە دوو بەشەوە . بەشی سەرەوەی ژمارەکە نیشانەی جیاوازی یەو لەخوارەوە دەست نیشانی نوسخەی جیاوازو جیاوازی یەکە کراوە .

بەشی دووەم، ژمارەکە نیشانەی ژمارەی دێڕە لە پارچەکەداو ئەگەر وشەیەك لەو دێڕەدا پێویستی بە لێکدانەوە بووبێ، ئەوا لێکدراوەتەوە .

زۆر جار هەندێ وشەی سادەو ساکارم لێکداوەتەوە، ڕەنگە مەبەست هەر بۆ تێگەیاندنی خوێنەر نەبێ . بەڵکو بۆ مەبەستی کەرەسەی زمانەوانی و بەراورد و وشەی لە یەکچوو ئامادەکردن بێت . هەروەك ئەشبینین بەرە بەرە نەوەیەك پێدەگات کە بناغەی خوێندنەکەی بە کوردی پەتی یەو لەو وشانەی شیعری کلاسیکی ناگات کە هەندێکیان کوردین و هەندێکیان لە شیعری زمانانی تری ڕۆژهەڵاتەوە وەرگیراون، یا لەواندا بەکاردێن . لەبەرئەوە ئەگەر ئەم وشانە ئەمڕۆ ئاسان بن، سبەینێ گران و ڕەنگە ون بن . لەبەرئەوە ماناکانیم بەوکوردی یە پەتی یە لێکدایەوە کە ئەمڕۆ بەکاردێن .

بەم جۆرە دیوان و پەراوێزو لێکدانەوەی ئامادە کرا . بەپێی تێگەیشتن و بۆچوونی خۆم بە ئیملای تازە شیعرەکانم نووسی یەوە . پاش ئەوە ڕەشنووسەکەم دا بە

هاوڕێی شاعیرو شارەزام مامۆستا کاکەی فەللاح کە گەلێك تێبینی بەنرخی لەبارەی ڕاستکردنەوەی شیعرەکان و بەراوردی نوسخەکانەوە دامێ و سوودی زۆرم لێ بینی . هەروەك لە کاتی تۆمارکردنی ئەو تێبینی یانەی ئەودا مامۆستای شاعیر عەلی عارف ئاغاش لەوێ بووو تێبینیە بە نرخەکانی ئەویش چوونە پاڵ ئەوانەی کاکەی فەللاح و دیوانەکەیان پێ تۆکمە تر کرا . سوپاسی بێ پایان بۆ هەردووکیان . سوپاس بۆ برای بەنرخم کاك ئەفراسیاب جاف کە ئەم ئەرکە بەرزەی پێ سپاردم . سوپاس بۆ هەموو کارمەندانی کتێبخانەی گشتی سلێمانی کە لە سایەی نەوازشی ئەواندا لەو کتێبخانەیە ئەم ئەرکەم بەجێ هێنا، بە تایبەتی بۆ کاکە شێرکۆی جاف و کاك عەبدوڵلاّ کەریم عەلاف کە یارمەتی یانم لەبیر ناچێتەوە . هەروا بۆ براکانی ترو، بۆ خوشکانی کتێبخانەیش و هیوادارم نموونەیان زیاد بێت .

بەغدا ١٩٨٥/٨/١

تێبینی: کارەکەم تەواو کردبوو کە لە مەجمەعی عیلمی دەستنووسێکی تری مامۆستا نەجمەدین مەلام دی کە لە شاری بەغدا لە ڕۆژی ٢٩ ی مارتی ساڵی ١٩٤٦ میلادی بۆ تۆفیق وەهبی نووسیوەتەوە . (٩٣) پارچەی تێدابوو، جیاوازی لەگەڵ نوسخەکەی تردا نەبوو . بۆ دڵنیایی بەراوردمان کردەوەو کەلێنی نوسخە دەسخەتەکەی خۆیمان پێ پڕکردەوە .

(١)

١- بەخەتا چوو بوو، خەتای کرد، بەخودا، موشکی خەتا
هاتبوو لافی لەگەڵ پەرچەمی تۆدا لێ دا

٢- بەئومێدی ئەوە ڕابووریێ بەسەرما ڕۆژێ
کەوتووم من لەسەری ڕێگەکەیا دەستو دوعا

٣- بەس بلاوێنە ڕەقیب، وا دڵەکەم لەت لەت بوو
سابکە لوتفێ لە حەق بەندەیی خۆت، تو بی خودا

٤-غەمو دەردو خەفەتو عاجزیو دووریی تۆ
زەحمەتە جێگەوو گونجایشی بێتۆ[٥٤] لە دڵا

٥- کەوتە سەر ڕوومەتی ئاڵت عەرەقی ناز ئێستا
هەر ئەڵێی شەونمی پەخشانە بەسەر بەرگی گوڵا

٦- زوهرەو موشتەری ئێستاکە لەخۆشی چاوت
وەکو سەرخۆش لەسەما کەوتنە ناو ڕەقسو سەما

---

[٥٤] گ: بێتێ .

١- بە خەتا چوو: بە هەڵەدا چوو، هەڵەی کرد . موشك: میسك . خەتا: ناوی کۆنی خوارووی وڵاتی چینە .

٢- دەستەودوعا: بە دوعاکردنەوە . بە نزاوە .

٥- شەونم: خوناڤ،ئاورنگ . پەخشان: بلاو . بەرگ: پەڕە .

٦- زوهرەو موشتەری: دوو ئەستێرەن . لێرەدا جۆرە تەوری یە یەکیش هەیە، زوهرە بە مانا گوڵو موشتەری بە مانا کڕیار .

(٢)[١]

١- فوستانی ڕەشی نازکی چین چینی لەبەردا
وەك هەوری سیا بێ بەسەری قورسی لەبەردا

٢- قوربانی نیگاهی غەزەبت ڕۆح و دڵی من
یەك لەحزە دووسەد تیرو ڕمت چۆن لە جگەردا

٣- مادام کە بەشمشێری برۆت لەت لەتە جەرگم
لازم نی یە ئەو خەنجەرە کردووتە بە بەردا

٤- دوو دیدەیی مەخمووری نیگارم بە شەباهەت
وەك ئاهو وەهایە کە لەخەو بێ لەسەحەردا

٥- دەستێ کە بەداوێنی ئەتۆ، دەستێ بەدڵ بم
چی بکەم کە نی یە دەستێ بکەم خاکێ بەسەردا

٦- قوربان وەکو خاکی بەری پێت کەوتووە دایم
(ئەحمەد) کە مەگەر دولبەری خۆی لەگوزەردا

[١] ئەم قەسیدەیە لە مێژووی ئەدەبی کوردی عەلائەدین سوجادیدا تۆمارکراوە، لە نوسخەکانی تردا نەبوو . تەنیا (ئو) لەوێوە وەریگرتبوو .

١- فوستان: (فستان-ف): لە عەرەبیدا بە (فساتین) کۆدەکرێتەوەو دەشێ بە فسگان و فساگین - بەرگی ژنانەیە .

٢- نیگاه - ڕوانین . غەزەب (غچب-ع): تووڕەبوون و حەز بە تۆڵەسەندن . لەحزە:تاو .

٣- لازم نی یە: پێویست نی یە .

٤- دیدە: چاو . مەخموور: مەست . بە شەباهەت:بە لێك چوون . ئاهوو:ئاسك، مامز .

٥- کەمالی ئەڵێ:

دەستێ بە زامی سینەو دەستێ بە دامەنی تۆ
دەستی ترم لە کوێ بوو خاکێ بکەم بە سەردا

٦- لە گوزەردا: بە ڕابووردن .

## (٣)

١- گوڵ لەگوڵزارا نەما بولبول ئەبێ زاری بکا[١]

شێوەیی شادی لەسەر دەرکات‌و غەمباری بکا

٢- نێرگسی شەهلا کە مەشهورە بەمەخمووری ئەبێ[٢]

دایما لەو چاوە کەسبی عیلمی بیماری بکا

٣- فەسڵێ[٣] ئەو ناسك‌و غەزاڵە ڕۆیی عوششاقی حەزین[٤]

هەر ئەبێ سەیلی سروشکی خوێن لەچاو جاری بکا

٤- توو خوا بادی[٥] سەبا بەو نازەنینە تۆ[٦] بڵێ

بەس ڕەقیب تەلتیف بکات‌و دەردی دڵ کاری بکا

٥- دولبەرم لەم شارە ڕۆیی (ئەحمەد) بێچارە وا

بۆ سوپاهی غەم ئەبێ ڕەسمی سوپەهداری[٧] بکا

---

[١] ئەم غەزەلە لە نوسخەی (ز)و (ئو) دا بەم چەشنە بوو، ئەوەی (نو) دەست نیشانی جیاوازییەکانی چاپی (ع)ی کردووە.

[٢] ع: ئەڵێ

[٣] ع: وەختێ

[٤] ع: هەژار

[٥] ع: بای

[٦] ع: بەو نازەنینەی من

[٧] ع: سوپەداری

١- زاری بکا: بگری .

٢- دایما: هەمیشە . کەسبی عیلمی بیماری بکا: زانستی بیماری دەستکەوێ .

٣- فەسڵ: وەرز، کات . غەزال: ئاسك . عوششاق: عاشقان، دڵداران . حەزین: خەمناك . سەیل: لێشاو . سروشك: فرمێسك، ڕوندك، هەسرین، ئەسرین، هێستر . جاری: ڕۆیشتوو، ڕژاو .

٤- باد: با . سەبا(صبا): بایەکە لە ڕۆژهەڵاتەوە دێ .

ڕەقیب: لە شیعری کوردیدا بە مانا ناحەز یا ئەو کەسە دێت کە بەدووای یاراندا ئەگەڕێ . تەلتیف بکا: دڵخۆشی بداتەوە یا نازی بگرێ .

٥- سوپاه: لەشکر . ڕەسم: ڕێ‌و شوێن، عادەت بەجێهێنان .

(٤)

١- من ئەڕەنجێنێ نیگارو وا ڕەقیب دڵشاد ئەکا[1]
بێخ و بنچینەی حەیاتو[2] عومری من بەرباد ئەکا

٢- بێستوون ئێستەش کەوەقتێ[3] لالەیی لێ سەوز ئەبێ
باسی خوێنی دیدەو داغی دڵی فەرهاد ئەکا

٣- بولبولی دڵ، وا لەدەوری ڕوومەتی گوڵڕەنگی تۆ
بێ قەرارە، شەو هەتا ڕۆژ ناڵەو فەریاد ئەکا

٤- بێت و گەر ڕوخسارو باڵای ئەو نیگارە دەرکەوێ
گوڵ خەجاڵەت بار ئەبێ پەست و نیگون شمشاد ئەکا

٥- قەت نەبوو ڕەحمێ بەحاڵی ئەم دڵەم کا کافرە
شاهی من لەخوا نەترسە، زاڵمەو[4] بێداد ئەکا

٦- (ئەحمەد) ی بێچارە بۆ دەردو موسیبەت مایەوە
دولبەری بێ ڕەحمی ئەو، سەیرو سەفای بەغداد ئەکا

---

[1] ئەم غەزەلەم لە نوسخەی (نو) وەرگرت .
[2] ع: ژیان .
[3] ع: بێستوون ئێستاش کە وەختێ .
[4] ع: جەور ئەکاو

١- بەرباد ئەکا: ئەیداتە بەر با، بە مانا نایهێڵێ و لەناوی ئەبا . حەیات: ژیان .
٢- بێسوون: کێوی بێستوون .
دەکەوێتە وەقتێ: کاتێ، کاقێ . لالە: گوڵاڵە سوورە، بە گوڵێکی نا کێویش دەووترێ .
٣- بێ قەرارە: بێ ئارامە، بێ گاڤە . فەریاد: بانگ، دەنگی بەرز، هانا .
٤- نیگون: سەرەوژێر . شمشاد: درەختێکی هەمیشە سەوزە، (شمشاڵ)یشە .
٥- زاڵم (ڤالم): زۆردار . بێداد: ناعەدالەت .
٦- موسیبەت (مصیبە): نەگبەتی، ناخۆشی . سەیرو سەفا: ڕابواردن، کەیف و زەمزەمە .

(٥)

١- یار[1] بەماچی لێوی خۆی زامی دڵان سارێژ ئەکا[2]
توند تەماشا کردنێکی شەخسی عاقڵ گێژ ئەکا[3]

٢- ئەی خودا تاکەی لەدەرهەق من وەفاو مەیلی نی یە
بۆچ گلۆڵەی بەختی من هەر ڕوو لەجێگەی لێژ ئەکا

٣- ماڵەکەم وێران ئەکا، ڕۆژم ڕەش و تاریك ئەبێ[4]
یار بەسورمەی ناز کە وەختێ چاوی خۆی[5] کل ڕێژ ئەکا

٤- وشکە سۆفی هاتبوو ئەیووت بەهەشت هەر بۆ منە
ڕیشی خۆی جوولان وەکو سابرێن کە شەو کاوێژ ئەکا[6]

٥- کەی خوا توججارە، خوا گەورە غەفوورو عادلە[7]
چۆن[8] لەگەڵ عەبدا حیسابی قەرزی ڕۆژوو و نوێژ ئەکا

٦- قافیە هەرچەندە تیکرارە[9] بەڵام (ئەحمەد) بەدڵ
هەر بە یادی تاقی ئەبرۆی تۆیە[10] جار جار نوێژ ئەکا

---

ئەم غەزەلە لە نوسخەی (ش) دا بوو .

[2] گ: دەکا .

[3] گ: (هەر تیلای چاوێکی پیاوی خیرەمەندو) گێژ ئەکا .

[4] گ: ماڵم ئەڕمێنێ دڵم ئەشکێنێ ڕۆژم تار ئەبێ .

[5] گ: دووچاوی بازی .

[6] گ: با لەوەڕ بۆ ئەو بێ چونکە وەك بزن کاوێژ ئەکا
نوسخە: لەو مویارەك بێ کە چونکە وەك بزن کاوێژ ئەکا

[7] گ: خۆ خودا توججار نی یە، لێ بوردووەو بەخشش ئەدا .

[8] گ: کەی .

[9] گ: دووبارەیشە .

[10] نوسخە: ئەبرۆتە کە .

١- شەخسی عاقڵ: کەسی هۆشمەند .

٢- مەیل: ئارەزوو .

٣- سورمە: کل .

٤- سابرێن: بزنە نێر، نێری، تەگە .

(٦)

١- دڵ وەکو بولبول لەهیجری نەوگوڵێ ئەفغان ئەکا
ناری جەرگ‌و سۆزی سینەم عالەمێ بوریان ئەکا[١]

٢- وادیارە لەم ولاتی کۆهسارە عاجزە
مەیلی خاکی گەرمەسێرو هەم قەلای شیروان ئەکا[٢]

٣- ئەم ولاتی بێ سەفایە، ساردە بۆ عوششاقی ڕووت
ئیشتیاقی بەر هەتاوی ڕوومەتی خووبان ئەکا[٣]

٤- بارش‌و بارانی هەوری چاوەکانم جاری یە
زەڵمە یاخۆ تانجەرۆیە تێکەڵی سیروان ئەکا

٥- هەرکەسێ ئەمڕۆ لەڕێگای[٤] ئەو نیگارە ڕێی بێ
بۆ سبەینێ گەپ بەموڵك‌و تەختی شاو سوڵتان ئەکا

٦- ئافەرین بۆ لەشکری موژگان‌و زولفەینی سیات[٦]
وا بەیەك دەم موڵکی جان‌و[٧] دڵ هەموو وێران ئەکا

٧- بەرقی ئاه و سەیلی دیدەی من لە هیجری دولبەرم[٨]
هە ر ئەڵێی هەوری بەهارە ناڵەو تۆفان ئەکا

---

٥- توججار: بازرگان . لە کوردیدا شێوە (کۆ-جمع)ە عەرەبی یەکەی بۆ تاك (مفرد) . غەفوور: لێبوردوو، گوناه بەخش . عەبد: بەندە، کۆیلە . ٦- تیکرار: دووبارە .

[١] ع: ئاگری جەرگم خەریکە عالەمێ بوریان ئەکا .

[٢] ع: مەیلی خاکی گەرمەسێرو قەلعەکەی شیروان ئەکا.

نو: مەیلی خاکی گەرمیان‌و

[٣] ع: ئارەزووی شەوقی هەتاوی ڕوومەتی جانان ئەکا .

[٤] ع: دەرگای .

[٥] ع: گەپ بە موڵك‌و تەخت‌و تاجی پادشاو سوڵتان ئەکا .

[٦] ع: برژانگ‌و دوو زوڵفی ڕەشت .

[٧] ع: وا بەجارێ موڵکی گیان‌و .

[٨] ع: بەرقی ئاەو ئاوی چاوی من لە دووریی دولبەرم .

٨- مەحمەلی لەیلا دەخیلم تۆ[٩] بەتوندی وا مەڕۆ
عاشقی مەجنوون سیفەت لەم دەشتەدا گریان ئەکا
٩- وا بە یادی تیغی ئەبرۆی دولبەری بێ ڕەحمی خۆی[١٠]
(ئەحمەد)ی عاشق خەریکە ڕۆحی خۆی قوربان ئەکا

---

[٩] ع: وا .
[١٠] ع: ڕەحمەکەی .
[١١] ع: ئەحمەد ئێستاکە خەریکە گیانی خۆی قوربان ئەکا .

١- هیجر: دووری، لەیەك جیابوونەوە . نار: ئاگر . سینە: سنگ . عالەم: جیهان، لێرەدا بەمانا خەڵکە . بوریان: سووتاو .
٢- قەڵای شیروان: قەڵای محمد پاشای جافە . لەوە ئەچێ زۆر کۆن بێت و ئەو تازەی کردبێتەوە . لە گوێ سیروان و نزیك کەلارە
٣- ئیشتیاق: تاسە، ئارەزوو . خووبان: چاکان .
٤- زەڵم: سەرچاوەو شاخێکە نزیك خورماڵ ئاوەکەی بەرەو شارەزوور ئەڕوا تاڤگەکەی بەناوبانگە . تانجەڕۆ: ڕوبارێکە لەخوارووی سلێمانی یەوە . سیروان: ڕووبارێکە لە کوردستانی ئێرانەوە دێ . بە ناوچەی هەڵەبجەو دەربەندیخاندا ئەڕواو لە عەرەبستان ناوئەنرێ دیالە .
٥- گەپ: گاڵتە، حەنەك .
٦- موژگان: برژانگ، مژیلان . زوڵفەین: دوو زوڵف . سیا: ڕەش . جان: گیان .
٧- بەرق: بروسکە . سەیل: لێشاو . دیدە: چاو تۆفان: لافاوی گەورە .
٨- مەحمەل: کەژاوە . مەجنوون سیفەت: وەك شێت، یا وەك مەجنوونی قەیسی بەنی عامیر .

(٧)

١- عادەتی ئەم چەرخە وایە، ئەهلی دڵ غەمگین ئەکا
شا هەمیشە ماتە، پیادە مەیلی جێی فەرزین ئەکا
٢- ئەبلە وا دایم لەعەیش‌و[1] شادمانی و عیزەتا
ئەهلی عیرفان‌و کەماڵ ئێستاکە زاری‌و شین ئەکا
٣- دوژمنە چەرخی فەلەك، بۆ پیاوی ساحێب عەقڵ‌و هۆش[2]
ڕووی کەرەم دایم لە هەرزەو شێت‌و[3] بێ تەمکین ئەکا
٤- سەیری کەن عاشق کە چەند شێتە ئومێدی مەرحەمەت
لەو نیگارەی، دڵ فریبەی[4]، زاڵمەی بێ دین ئەکا
٥- بێستوون وەختێ کە لالەی ئەحمەری لێ سەوز ئەبێ
مەشقی[5] لێوی شەکەرینی ناسکی شیرین ئەکا

---

[1] ع: خۆشی‌و .
[2] ع: خاوەن هۆش‌و فام .
[3] ع: پیاوی .
[4] ع: دڵفرێنەی .
[5] ع: یادی .

٦- عاشقی[٦] مەجنوون بەیادی دولبەری لەیلا سیفەت[٧]
خوێنی دوو چاوی بەخوڕ دێ دامەنی ڕەنگین ئەکا
٧- قەت لەزیکری خێری تۆ غافڵ نیە (ئەحمەد) بە شەو
هەر بە ئومێدی ویسالت سەر لەسەر بالین ئەکا

[٦] نو: عاشقە .
[٧] نو: جەمال .

١- پیادە: ئەفەری یاری شەترنجە، فەرزین: لە شەترەنجا بە وەزیر دەڵێن .
٢- ئەبلەە: گێژ، وڕ، بێ مێشك . عەیش: ژیان، لێرەدا بە مانا کەیف و خۆشی یە . عیززەت (عزە): بەرزی، سەرفرازی .
٣- کەرەم: بەخشندەیی . هەرزە: بێکارە، بێهوودە . تەمکین: توانا .
٤- دڵ فریب: دڵ فریودەر .
٥- ئەحمەر: سوور، لالەی سوور: گوڵاڵە سوورە .
٧- زیکر (ژکر)ناوبردن، بەبیراهاتن . ویساڵ (وصال): پێگەیشتن . بالین: سەرین، بالیف .

(٨)

١- خوێنی دوو چاوم به نەوعی دامەنم ڕەنگین ئەکا
هەر کەس ئەمبینێ بەحاڵی ناتەوانم شین ئەکا
٢- شێخی ئیرشادو موریدو سالیك و سۆفیو فەقێ
ئەو بەیەك نواڕین بە جارێ کافرو بێ دین ئەکا
٣- هیچ خەنە پێویست نیە بۆ دەستو پەنجەی دولبەرم
وا بەخوێنی من خەریکە دەستو پێی نەخشین ئەکا
٤- قەت لە لێوی شەککەر ئەفشانی[1] قسەی خۆشم نەبیست
دایما بێ دینە مەشغووڵە دڵم غەمگین ئەکا
٥- وا لەهیجری قامەتی سەروی نیگاری نازەنین
ئەم دڵەم قومری سیفەت هەر گریەو ناڵین ئەکا
٦- گەر بڵێ ی (ئەحمەد) لەیاری بۆسەیێ داوا بکا[2]
ڕوو ئەچەرخێنێ لەتۆ و گوێی لەو قسە سەنگین ئەکا[3]

---

[1] گ: شەککەرستانی .
[2] گ: بێتو ئەحمەد ماچێکی لەو یارە گەر داوا بکا .
[3] ز: ڕووی نەچەرخێنێتو گوێی خۆی لەو قسە سەنگین ئەکا .

١- دامەن: داوێن .
٢- سالیك: ئەو کەسەی ڕێی تەسەوفی بە کردار گرتووە .
٤- شەککەر ئەفشان: شەکرڕێژ، شەکر بلأوکەرەوە . مەشغووڵە: خەریکە .
٥- قامەت: بالأ . قومری سیفەت: وەك قومری، کە باڵندەیەکە .
٦- بۆسە: ماچ، ڕاموسین . سەنگین: قورس، گران .
- لە نوسخەکەی نەجمەدین مەلادا لە مەجمەع دێڕێکی زیاد هەیە کە دووەم دێڕە:
چەن دڵی عاشق ئەسیری بەندی زنجیری ئەبن
یار کە وەختێ زوڵفەکانی وەك کەمەند چین چین ئەکا .

(٩)

١- وەرە بگرە بە یادی چاوی دولبەر پیاڵەی سەهبا[١]
پەشێوبە هەروەکو مەجنوون لەهیجری قامەتی لەیلا

٢- کە دەرخا دولبەرم ئەو گەردنی ساف بلوورینی
لە پەنجەم موو دەرێ، گەر دەس درێژ کەم بۆ ملی مینا

٣- غولامی و بەندەیی ئەو شۆخە گەر دەستم کەوێت حەیفە
تەنەزول کەم کە بچمە مەسلەکی ئەسکەندەرو دارا[٢]

٤- لە عەشقی چاوی تۆ یا یادگاری قەلبی عوششاقن
کە پڕبوون ئەم کەژو کێوە لە لالەو نێرگسی شەهلا

٥- گریبانی نواندو پێکەنیو فەرمووی تەماشاکە
کە ئەمڕۆ موعجیزەی من چاکترە یاخۆ (یەدی بەیزا)[٣]

---

[١] ز: سەهبا، لە نوسخەکانی تردا (شەهبا) نووسراوە .
[٢] گ: تەنەزول کەم کە بچمە موڵکی ڕۆم ئەسکەندەرو دارا .
[٣] بیچا: سپی، یەدی بێزا .

١- سەهبا (صهبا ) بۆ نێرینە (اصهب)ە . بە موو یا قژێك ئەووترێ کە سووری یا زەردیی تێدابێ . یا بە کەسێك دەووترێ سوورو سپی بێ . بۆ (مەی) بەکاردێنرێ لەبەر ڕەنگەکەی .
شەهبا (شهبا ) بۆ نێرینە (اشهب) ە . ئەمیش بۆ ڕەنگە - بۆ ڕووەك ئەوەیە کە زەرد بوو بێو سەوزیی تێدا بێ . بۆ چیا ڕەش بێو سپی بەفری تێکەڵ بووبێ . بە شێریش دەووترێ . لێرەدا ئەگەر سەهبا بێ یا شەهبا هەر بۆ مەیەو بۆ ڕەنگەکەیەتی .
٢- مینا: شووشە، بە مانا سپی .
٣- ئەسکەندەر . ئەسکەندەری گەورە (٣٥٦-٣٢٤)ی پێش میلاد، بە زولقەرنەین ناسراوە . پاشاو جیهانگرێکی بەناوبانگە . لە هەولێر (٣٣١) ی پ . م بەسەر داریۆسدا سەرکەوت: بە مەکدۆنیش ناسراوە .
دارا: یا داریۆس ناوی سێ پاشای ئەخەمینی یە . داریۆسی گەورە لە (٥٢١-٤٨٥) پێش م دا ژیاوە . دووا داریۆس (٣٣٦-٣٣٠) پ.م ئەوەیە کە ئەسکەندەر بەسەریا زاڵ بوو .
٤- قەلب: دڵ .
٥- گریبان: یەخەی کراس . یەدی بەیزا: (الید البیچا و) ئیشارەتە بۆ موعجیزەی مووسا لە کێوی توور .

## (١٠)

١- مەیلی سەیری بەدر ئەکا دڵ، لادە زوڵفی وەك حیجاب
دەرخە بەدری ڕوومەتی خۆت شۆخەکەی عالی جەناب
٢- سینە کون کون بووم وەکو نەی من لەبەر هیجرانی تۆ
سەر وەکو سەمتووره، دڵ هەر ناڵەیەتی وەك ڕوباب
٣- تۆ دەرتخست شەمعی ڕووی خۆت کۆمەڵی عاشق هەموو
لازمە هەروەك پەپوولە ببنە قاورمەو کەباب
٤- لوتفی یار هەر بۆ ڕەقیبە من ڕەزام ئەو دولبەره
جاربەجار حەتا بە جوێنی بێتو بمداتۆ جەواب[1]
٥- لادە چارشێوت هەتا من دیدە ڕۆشن کەم بەڕووت
بەسیەتی قوربانی تۆ بم بەس بکە نازو عیتاب
٦- (ئەحمەد) ە تەنها غولامی موخلیسی تۆ چاوەکەم
حەیفە مەیڕەنجێنە مەیدە بێ سەبەب جانی[2] عەزاب

[1] گ: بە چوونیش بێتو بمداتێ جەواب .
[2] ئەگونجێ ئەمە (جانێ) بێ لە شێوەی بانگ کردنا یا (جانێ) بێ واتە گیانی ئەو .

١- بەدر: مانگی تەواو، مانگی چواردە . حیجاب: پەردە، پەچە .
٢- نەی: قامیش یا نای و شمشاڵ، لێرەدا کە دوو ئامێری تری مۆسیقای بەدووادا هاتووە کە (سەمتوورو ڕوباب) ن نایەکە زیاتر دەگونجێ .
٣- شەمع: مۆم، شەم، شمالك . پەپوولە: پەروانە، پلاتینك .
٤- جەواب: وەڵام . لێرەدا (بمداتۆ) لە شێوەی هەڵەبجەو جافەتیدا لە جێ ی (بمداتەوە) ی ناوچەی سلێمانی دەگرێتەوە .
٦- چارشێو: پەچە، ڕۆشن: ڕووناك . عیتاب: گلەیی، گازندە .
٧- غولام: بەندە، کۆیلە، خزمەتکار، پیاو . موخلیس: دڵسۆز . سەبەب: هۆ . عەزاب: ئازار، ئەشکەنجە .

(١١)

١- یار ماچی لێوی خۆی کە بکا ئێستە بۆم بەرات
لام خۆشترە نە شەهدو لەسەد چەشمەیی حەیات

٢- یارەب لەت و کوت و شەق و پەق بێ دڵم ئەگەر
بێ یادی تۆ بێ یەك دەم و یەك ئان و یەك سەعات

٣- جارێ بەتیری غەمزە دڵم کون ئەکا دەمێ
زەردەخەنەو نیگاهی لەنوێ پێم ئەدا حەیات[١]

٤- فەرمووی براله تو سەری خۆت لاچۆو زوو برۆ
پێم وت کەرەم کە ماچی دەمت ئێستە بۆ برات

٥- جوێندان و تووڕە بوون و قسەی توندو تاڵی تۆ
لام چاترە لە نوقڵ و لەجامێکی پڕ نەبات

٦- قوربان غولامی قاپی یەکەت (ئەحمەد) ە بەدڵ
سا بیکوژە لەدەردو ئەلەم بیدە زوو نەجات

---

[١] لە دیوانە چاپکراوەکەی گیوی موکریانیدا تا ئێرەی ئەم قەسیدەیە هەیە .

١- بەرات: بەخشش . شەهد: هەنگوین لەناو مێوەکەیدا . چەشمە: سەرچاوە . حەیات: ژیان .
٣- غەمزە: ناز، بە چاو یا برۆ . دەمێ: کاتێ، گاڤێ . لەنوێ : ژنۆڤە، سەرلەنوێ .
٤- براله: ئەی برا، برای بچووك .
٥- جوێندان: خەبەردان، سخێف کردن . تووڕە بوون: سڵ بوون .
٦- نوقڵ: شیرینی .
٧- قاپی: دەرگا، دەری . ئەلەم: ئازار . نەجات: ڕزگار .

(١٢)[١]

١- زاهید وەرە ناو[٢] بەزمی حەریفانی خەرابات
لادە لەڕیاو سەرزەنشتی قۆڕو[٣] خەرافات

٢- یەك جورعە بنۆشە لە مەیی بێ غەش‌و[٤] گوڵرەنگ
ئەسڵەن[٥] مەکە تۆ بەو پڕوپووچانە موبالات

٣- بیستوومە وەیا دیومە لە گوفتاری ئەدیبان
بۆ خواردنی یەك قەترە دوو سەد جۆرە موکافات[٦]

٤- حوکمی ئەزەلی چونکە نی یە قابیلی تەغییر[٧]
بۆچی من ئەترسم لە جەزاو ڕۆژی حیسابات

٥- مایل نە بە حوورو نە بەغیلمانی بەهەشتم
گەر بێت‌و بکەم من لەگەڵ ئەو شۆخە مولاقات

٦- (ئەحمەد) دڵی بێزارە لە ئەتواری ڕیاکار[٨]
ساقی قەدەحێ تێکە بە ئاهەنگ‌و مەقامات

---

[١] ئەم قەسیدەیە لە (ژیانەوە) ی ژمارە ٦ی ساڵی ١٩٢٤ دا بەم چەشنە بڵاوکراوەتەوە . کاك حەمە بۆریش بەو چەشنە نووسیویەتی یەوە .

[٢] ع: ناو . [٣] ع: پووچ‌و . [٤] ع: بێ غەشی . لە ژیانەوەدا بێ غەش‌و یەك ڕەنگ . [٥] ع: هەرگیز . [٦] ئەم دێرە لە چاپکراوەکەی عەلی کەمال باپیردا لادراوە . [٧] گۆڕان . [٨] ع: لە ڕیش‌و سەرو مێزەر .

١- حەریفان: ڕەفیقان، هاوەڵان . خەرابات: مەیخانە . خەرافات: پڕوپووچ .

٢- جورعە: قوم . موبالات: دەربەس بوون، گوێ پێدان .

٣- قەترە: تنۆك، قوم . موکافات: پاداش .

٤- ئەزەلی: هەمیشەیی، خوایی . تەغییر: گۆڕین . جەزا: بە مانا پاداش‌و سزاشە . ڕۆژی حسابات: ڕۆژی قیامەت‌و زیندوو بوونەوە .

٥- مولاقات: یەکتر بینین .

٦- ئەتوار (اگوار): ڕەفتار، بارو حاڵ . قەدەح: جام، پیاڵە .

(١٣)

١- دڵم پڕ خوێنە، جەرگم لەت لەتە بۆ لێوی گوڵنارت
نەخۆش و دەردەدارم من لە حەسرەت[١] چاوی بیمارت

٢- سەلیبی[٢] پەرچەمی تۆم دەسکەوێ چیم لە ئیسلامی
کڵێسا جێگەمە جانا[٣] لە عەشقی زوڵفی زوننارت

٣- وتی عاشق ئەبێ بەم کوشتنەت مەسروور ببی چونکە[٤]
لەناو عوششاقدا تەنها ئەتۆی قوربانی دڵدارت

٤- شکا بازاڕی شەهدو شەککەرو شیرینی قەنناد
لە ڕۆژێکۆ کە بیستوویانە خەڵقی[٥] نوتق و گوفتارت

٥- ئەبێ کاغەز لە بەرگی گوڵ، قەڵەم جانا[٦] لە عەنبەر بێ
کە من مەیلم هەیە ئێستا بنووسم وەسفی ڕوخسارت[٧]

٦- کە تۆ سەروی منی[٨]، بێچارە قومریی دڵ حەزینی تۆم
هەمیشە بولبول ئاسا وام لە دەوری باغ و گوڵزارت

٧- نیگار ئەمڕۆ لەناو جەمعی ڕەقیبا پێ ی وتم (ئەحمەد)
مەحاڵەت تۆ ئیتر دەستت کەوێ[٩] یاری دڵ ئازارت

---

[١] ع: لە داخی . [٢] ع: چلیپای . [٣] ع: گیانە . [٤] ع: مەسروورو دڵخۆش بێ . [٥] ئو: خەڵکی . [٦] ع: گیانە . [٧] ع: کە مەیلم بێ بنووسم من بەڕاستی وەسفی ڕوخسارت . [٨] ع: منیش . [٩] ع: مەحاڵە تۆ ببینی قەت ئیتر یاری .

١- گوڵنار: گوڵ هەنار، یا گوڵ ئاگرین .

٢- سەلیب: خاچ، چلیپا . زوننار: پشتێنێکە قەشە بە پشتی یەوە ئەبەستن، یا گەردن بەندێکە مەسیحی بە خاچێکی بچووکەوە بە ملدا شۆڕی دەکەنەوە .

٣- مەسروور: شادمان .

٤- قەنناد:شەکرڕێژ، شەکر فرۆش . نوتق: قسە، وتار . (لە ڕۆژێکۆ) دیسان شێوەی هەڵەبجەو جافەتی یە . لە سلێمانی دەوترێ: لە ڕۆژێکەوە .

٥- عەنبەر: شتێکی بۆن خۆشە گڵ ڕەنگە .

٦- جەمع: کۆمەڵ .

(١٤)

١- دوو چاوم خوێن ئەبارێنیٚ لە عەشقی ڕوومەتی ئاڵت
گرفتارە لەناو زوڵفت[١] دڵم بۆ دانەیی خاڵت

٢- خوا کەی بێت کە من پەشتانی بالأو قامەتی تۆ بم
چ وەختیٚ پڕ بە چنگ بگرم[٢] دوو لیمۆی نەورەسی کاڵت

٣- نەخۆشی خۆشترە لای من لە ساغیو سیحەت ئەی جانا[٣]
ئەگەر یەك هەفتە جاریٚ بێی بپرسی چۆنە ئەحواڵت

٤- بە شاهی عالەمی ناگۆڕمەوە ئەمڕۆ لە دنیادا
جنێو و توندیو قەهرو[٤] قسەی نالایەق و تاڵت

٥- نیگارا لێم ئەپرسی[٥] بۆچی وا دێوانەیە (ئەحمەد)
لە عەشقی چاوی تۆیە چاوەکەم وا بووم بە عەوداڵت

---

[١] ع: لە زوڵفتدا .

[٢] ع: چ وەقتیٚ پڕ بە دەس بگرم .

[٣] ع: گیانە .

[٤] ع: جنێو توندیو قارو .

[٥] ع: نیگارا گە ئەپرسی .

٢- پەشتان: پێکەوە بنووین . نەورەس: تازە پێگەیشتوو .

٥- عەوداڵ: ئاوارە .

(١٥)

١- بێتاقەتو مەحزوونە ئەم دڵمە لەبۆ دینت
ڕەحمێ بکە سا قوربان دەرخە ڕوخی ڕەنگینت

٢- شەهدو شەکەر ئەی قوربان[١] بازاڕی شکا یەکجار
لەو وەقتەوە وا دەرکەوت لەعلی لەبی شیرینت

٣- گریەی منی بێچارە شامو سەحەر ئەی دولبەر
ئەسڵەن[٢] نی یە تەئسیری لای ئەو دڵی سەنگینت

٤- نەسرینو گوڵو لالە مەحجووب[٣] ئەبنو والە
گەر لابدەی ئەو بورقوع[٤]، دەرخەی تەنی[٥] سیمینت

٥- حوور و پەریو غیلمان بێ قەدرە لەلای (ئەحمەد)
لەو وەختەوە[٦] وا دیویە ڕوخساری نیگارینت

---

[١] ع: گیانە .
[٢] ع: هەرگیز .
[٣] گ: گوڵ لالە مەحبووب .
[٤] گ: گوڵ لالە مەحبووب .
[٥] نو: ڕوحی .
[٦] ع: لەو ڕۆژەوە .

تێ بینی: ئەم قەسیدەیە بە چەند جیاوازی یەوە بڵاوکراوەتەوە بە تایبەتی لە ژمارە ٩٩٤ی ساڵی ١٩٥٠ی ڕۆژنامەی (ژین) دا . بەڵام لە دەستخەتی خۆی بەم چەشنە وەرمان گرت .

١- (ئەم دڵمە) دیسان بەشێوەی دەوروبەری سلێمانی یەو لە سلێمانیدا دەبێ بە (ئەم دڵەم) . مەحزوون: خەمبار، خەفەتبار . ڕوخ: ڕوو .
٢- لەب: لێو، لێڤ .
٣- شام: شەو، شێو، ئێوارە . تەئسیر (تأپیر): کار، کارتێکردن . سەنگین: قورس، گران، بەردین .
٤- مەحجوب: شەرمەزار . والە: زاری . سەرگەشتەی عەشق . بورقوع: تارا، پەچە، سەرپۆش . تەن: لەش . سیمین: زیوین .

(١٦)

١- نی یه ڕەحمت له دەرهەق عاشقی شەیدایی میسکینت
بڵێ پێم تو خودا کافر چی یه تو مەزهەب ودینت
٢- به خاکا پێ بنێ، مەینێ[١] به دیدەی ئەشکبارمدا
مەبادا درکی برژانگم بچێته پێی حەناییینت
٣- مەیڵه ڕۆژی عاشق ڕەش ببێ ئەی یاری بێ مروەت
لەسەر سوبحی[٢] جەبینت لادە جانا زوڵفی چین چینت
٤- لالەزارە دەوری قەبرستانی[٣] عوششاقت
ئەکەن تەمسیلی لێوی لەعلو کوڵمی ئاڵو ڕەنگینت
٥- که ناوت دێنمه سەر لێوەکانم ئێستە ئەی جانا
دەم و لێوم ئەچەسپێن پێکەوە بۆ لێوی شیرینت
٦- به خەندەی نازەوه فەرمووی ئیتر بۆت فەخرە تۆ[٤] مردن
که ئەمڕۆ من به نازو[٥] لەنجەوە هاتوومە بالینت
٧- له سایەی ماچی لێوی ئەو شکا بازاڕی تۆ قەنناد
به پووڵێ ناکڕێ کەس ئێستە باری شەهدو هەنگوینت

---

[١] گ: تۆ نەك . ٢- گ: سەفحەی . ٣- گ: گۆڕستانی . ٤- گ: تا . گ: لارو .

١- مسكین: هەژار، بەسزمان .

٢- ئەشكبار: فرمێسكبار . مەبادا: نەوەك . جەنابین: خەناوی .

٣- سوبح: بەیان، سپێدە . جەبین: ناوچەوان، تەوێڵ، ئەنی .

٤- قەبرستان: گۆڕستان . تەمسیل: لاسایی، وەك ئەو .

لەعل: بەردێكی بەنرخە . لەعلی بەدەخشان ڕەنگی سوورە .

٦- فەخر: شانازی . بالین: پاڵ، لای سەرین، لای سەرو بالیفت .

٧- قەنناد: قەندفرۆش، شەكرفرۆش .

## (١٧)

**١- هەوری بەهاری بەسیە ئیتر ناڵە ناڵەکەت**
**گوڵ عاجزە لە گرمە و ناوچاوە تاڵەکەت**
**٢- پێم وت بڕێژە خوێنی دڵی عاشقت بە زار**
**دیسان بکە حەنایی سەری پەنجە ئاڵەکەت**
**٣- حاڵی پەشێوە دڵ بە خەیاڵی دوو زوڵفی تۆ**
**هەروەك وەنەوشە مل کەچە بۆ تاقە خاڵەکەت**
**٤- سەیری ڕەقیب کە وەك سەگە[1] بۆ مانگەشەو بە شەو**
**هەر لوورە لووری یە لە فیراقی جەماڵەکەت**
**٥- کون کون ببێ دڵی (ئەحمەد) ئەگەر دەمێ[2]**
**فاریغ ببێ لە یادی خاڵ و خەیاڵەکەت[3]**

---

[1] گ: سەگی .
[2] گ: خوایە گەر دەمی .
[3] گ: خەتو هەم خەیاڵەکەت .

١- حەنایی: خەنەیی، خەنەبەند .
٢- فیراق: دووری، لەیەك جیابوونەوە، لهەڵأ بوون . جەمال: جوانی، ڕندی .
٣- دەمێ: کاتێ . فاریغ(فارغ): بەتاڵ، والأ، ڤالأ .

(١٨)

١- هیجری تۆ چەند سەعبە[١] دولبەر ماڵەکەم وێرانە بۆت
ڕۆژو شەو غەمباری ڕووتم دیدەکەم[٢] گریانە بۆت

٢- ئەشکی[٣] چاوم بادەیە ناڵەی دڵم عەینی[٤] نەیە
خاك بەسەر بێکەس لە حەسرەت[٥] جەرگەکەم بوریانە بۆت

٣- ئەی نیگاری نازەنین لەو ڕۆژەوە دووری لە من
سەیلی دیدەم[٦] وا بەخوڕ دێ هەروەکو سیروانە بۆت

٤- ئەو بەلآی بۆ قامەتی تۆ دێ لە عوششاقت کەوێ
سەد هەزاران عاشقت جانا[٧] بەلآ گەردانە بۆت

٥- ئەی دڵە بەسیە لە غەم بۆچی[٨] ئەناڵی ڕۆژ و شەو
شەهدی لێوی دولبەرت بۆ دەردی تۆ[٩] دەرمانە بۆت

---

[١] ع: زۆر زەحمەتە .
[٢] ع: چاوەکە .
[٣] ع: ئاوی .
[٤] ع: هەروەك .
[٥] ع: خاك بەسەر خۆم وا لە دووریت .
[٦] ع: ئاوی چاوم .
[٧] ع: گیانە .
[٨] ع: تاکەی .
[٩] ع: دەردەکەت .

١- سەعبە: گرانە، زەحمەتە .
٢- ئەشك: فرمێسك . بادە: مەی یا پیاڵەی مەی . عەینی: وەکو، هەروەك . بریان: برژاو .
٣- سەیل: لێشاو، خوروژم، بەلآگەردانە:قوربانە، فیدایە .

(١٩)

١- ڕەقیبی سەگ هەتا چاوم کەلا کرد
منی دووچاری سەد دەردو بەلاٚ کرد
٢- نیگار وەك ئاسکی وەحشی وەهابوو
دەمو دەس چۆن لەگەڵ خۆی ئاشنا کرد
٣- کە دیمی ڕووی لەمن چەرخان و ڕۆیی
بەهانەی[1] ڕۆینی، شەرم و حەیا کرد
٤- شوکور ئەو شۆخە دەردی عاشقی زار
بە ماچی لێوی شیرینی دەوا[2] کرد
٥- کە تۆ ڕۆییت دڵی بێچارەیی من
ویداعی خۆی لەگەڵ عەیش و سەفا[3] کرد
٦- نە تەنها (ئەحمەد) ی بێچارە ڕووتە
قوماری عەشقی تۆ زۆری گەدا کرد

---

[1] ز: بەمانەی .
[2] ز: ڕەوا .
[3] ز: حەزا .

١- کەلا: تاقەوە بوو، دوورخراوە . ڕەنگە (کلا) باشتر بێ بەلاٚم بۆ ڕێکی شیعرەکە هەر ئەبێ (کەلا کرد)بڵێین .
٣- بەهانە: بیانوو .
٤- دەوا: دەرمان، چار .
٥- ویداع: (وداع): ماڵئاوایی . عەیش و سەفا: خۆشی، ڕابواردن .
٦- گەدا: هەژار، خەزان، پارسکەر، دەروەزەکەر .

(٢٠)

١- یەخەی خۆی دادڕی گوڵ یار کە مەیلی گوڵستانی[1] کرد
لە داخی قامەتت سەرویش لە باڵای خۆی کەمانی کرد

٢- لە تارمەی ڕوو بە مەغریب خۆی نیشاندا ئەو کلاّو لارە
وتم یاران کە حەشرە ڕۆژ لە مەغریب وا عەیانی کرد

٣- ڕەقیب شەرتە لە داخت تەرکی کەم من بەندەیی یارم
دڕك سا مژدە بێ بولبول کە تەرکی ئاشیانی کرد

٤- شەشی ئەیلوول ئەزانن ئێوە ئەی قەومی وەفا کردار
ئەوە ڕۆژێ بوو دوژمن قەتڵ و عامی کوردەکانی کرد

٥- بتی پەیمان شکێن ئەی کافری بێ ڕەحم و بێ مروەت
لە داخت (ئەحمەد)ی بێچارە وا تەرکی ژیانی کرد

---

[1] ڕەنگە (ناوگولانی) ڕێکتر بێت . (ع) .

١- کەمانی کرد: چەمیەوە .

٢- عەیانی کرد: دەرکەوت .

٣- ئاشیان: هێلانە، لانە، هێلین .

٤- قەتڵ و عام: قڕان . وەك لە پێشەکیدا نووسراوە ئەم باسی شەشی ئەیلوولی ١٩٣٠ ی سلێمانی یە وەك خۆڕپەیەك بە دڵی شاعیردا هاتووەو کەوتۆتە ناو قەسیدەکەوە .

(٢١)

١- كە دولبەر خۆی نواند خورشیدی خاوەر زوو فیراری کرد
خەجاڵەت ماو بە زەردی عەزمی پشتی کۆهساری کرد

٢- بەسۆزی سینە ناڵانی لە فەسڵی پایزا بولبول
کە ڕۆیە ناو گوڵستان و خەیاڵی نەو بەهاری کرد

٣- خوا ڕۆژی ئەزەل ئەو بەژن و باڵایەی کە تەسویر کرد
لە شەوقی ئەو بوو، خەلقی عەرعەرو سەروو چناری کرد

٤- ووتی میسکی[1] خەتا، بۆ من خەتایە لافی بۆن خۆشی
کە هاتوو بۆنی عەتری پەرچەمی شێواوی یاری کرد

٥- ڕەقیب وەختێ کە دی میهرەبانە دەرحەقی عاشق
تەقی کرد وەك سەگ و تۆپی، لە داخا ئینتیحاری کرد

٦- لە حەسرەت لێوی لەیلا بوو کە مەجنوون شێت و ڕیسوا بوو
بەجارێ کەوتە کێو و دەشت و سەحرا، تەرکی شاری کرد

٧- کەبیستی موژدەیی تەشریفی تۆ، عاشق لەخۆشیدا
حەیاتی مابوو تەنها و ئەویشی زوو نیساری کرد

٨- بژی ئەو شاهی حوسنە وا لەڕووی لوتف و کەرەمکاری
کەوا یادێکی حاڵی (ئەحمەد) ی ڕووت و هەژاری کرد

---

[1] ز: موشکی .

١-خورشیدی خاوەر: لێرەدا بە مانا ڕۆژی ڕۆژهەڵاتە و ئیشارەتیشە بۆ خورشیدی عاشقی خاوەر . فیراری کرد: ڕایکرد .

کۆهسار: چیا .

٣- تەسویر کرد (تصوير): نەخشاندی .

٥- میهرەبان: بە میهرو مەحەببەت و خۆشەویستی .

٦- ئینتیحاری کرد: خۆی کوشت .

(٢٢)

١- صبح چون خورشید رخشان سر بزد از کوهسار

(بانگ کردستان) ما پرتو فشان شد اشکار

٢- چون نسیم علمو عرفان بر مشام ما وزید

خواب پر شور جهالت کرد از سرها فرار

٣- گر بچشم عقل ما دقت نماییم این زمان

قوم کرد از لطف حق هستند جمله بختیار

٤- کور گشته چشم حاسد، بختشان پژمرده شد

از ترقی و تعالی همین قوم کبار

٥- روز عیش و شادی و گاه سرور و عشرت است

لایق است گر جان خود سازم بدین مژده نثار

٦- هرکسی اهمال ورزد بی گمان در وقت خود

روسیه گردد بدیوان خدا روز شمار[1]

---

[1] ئەم قەسیدەیەی بە فارسی نووسیوە، لە دەستنوس و چاپکراوەکانا نەبوو، لە ژمارە ٤ی ساڵی ١ی (بانگی کوردستان) دا کە لە ٢٨ی ئاغستۆسی ١٩٢٢ دەرچووە بەناوی (قایمقامی ئەلەبجە ئەحمەد موختار) ەوە بڵاوی کردۆتەوە . بەپێویستم زانی لە دیوانەکەدا ببێ .

(٢٣)

١- ئەگەر بینێمە سەر، خوودەی وەکو دنگ
دڵم کون کون ببیٚ[١] وەك ناوی بێژنگ

٢- چلۆن ئەیدەم بە خورمای قاچو قول ڕووت
قەدی بەرزی چنارو گوێزو هارژنگ

٣- لە زەیتوون چاکترە هەنجیرو سێومان
گەزۆم پیٚ خۆشترە[٢] سەد جار لە بالنگ

٤- بەڵام چی بکەم لەداخی ئەم زەمانە
وەکو مزراح سەرم کەوتۆتە ڤنگ ڤنگ

٥- ئەوەی بۆ پارە لای داوە لە مەسلەك
بەجیٚ دانیشتنی چل مێخو سەد سنگ[٣]

٦- وتم بەو حیزە ئەمڕۆ ڕۆژی تۆیە
بخۆ، دانیٚ بە مەیلت لنگ لەسەر لنگ

٧- دەشوبهیٚ حاڵی (ئەحمەد) وەقتی وەسڵت
بەڕۆژ هەڵهاتنو ئەحوالی ئاونگ

---

[١] گ: دڵم کون کون بیٚ هەر .

[٢] گ: چاترە .

[٣] ئو: چ دانیشتنی چل مێخ و سەد سنگ .
ز: بە جیٚ ی دانیشتنی بیٚ، مێخو سەد سنگ .

١- دنگ: ئەو ئامێرەیە برنجو ساوەری تێدا دەکوتن .

٢- هارژنگ: زیی دەوری باخ .

٣- بالنگ: جۆرێکە لە ترنج، مرەبای لیٚ دروست دەکرێت .

٤- ئاونگ: ئاورنگ، شەونم، خوناو .

(٢٤)

١- نموونەی ڕووی تۆیە پەڕەی گوڵ

فیدات بم ئەی بەنی جەرگ‌و پەڕەی دڵ

٢- توخوا ئەی گوڵ بەسە تۆ نازو عیشوە

چی یە ڕەحمێ بکەی جارێ بە بولبول

٣- نیگارا چی ئەبێ ماچێ کەرەم کەی

بکەی مەقسوودی ئەم بیمارە حاسڵ

٤- وەکو ناڵینی من وایە لە عەشقت

فوغان‌و زەمزەمەی بولبول لەسەر چڵ

٥- بەتوندی بەس بڕۆ، بێ، ڕۆحەکەی من

بە چاوما پێ بنێ با بەس بکا گل

٦- مەحاڵە تەرکی ساقی‌و یارو بادە

بەسە واعیز مەکە توخوا قسەی زل

(٢٥)

١- دڕك هاودەمیەتی بولبول، پەشێوە حاڵەتی بۆ گوڵ
بەهاران بۆیە ئەو دایم ئەكا هەر ئەم چڵ‌و ئەو چڵ

٢- لەلام وایە كە حەتتا خاكی ژێر كەوشی ڕەقیبانت
جەواهیر سورمەیە بۆ چاوەكانم، مەرهەمە بۆ دڵ

٣- زەمان بەم حیزی یە، تالع بە ئەم ناسازی یە ئەمڕۆ
نیگاریش لوتفی وابێ چۆن ئەبێ من مەتڵەبم حاسڵ

٤- بەرامبەر ئەبرووانی كەوتمە سوجدە، وتی عاشق
ئەگەرچی قیبلەگاهی تۆ كەچە نوێژت نی یە باتڵ

٥- تەوافی كەعبەیی دەرگانەكەت تەنها لەمن مەنعە
لە قورئانا ئەڵێ ی ئایاتی ڕەحمەت قەت نی یە نازڵ

٦- تەپ‌و كۆی ترپە ترپی دڵ، بە گرمە ئەمشەو ئەیباران
فیدای ئەو شۆخە، تەشریفی كە دێتە مەنزڵم باقڵ

٧- دەخیلم تۆ بزانە دەست‌و پەنجەی نازەنینێكە
بەگۆزەی تێ مەگە حەیفە، تو خوا تۆ مەیخەرە ناو گڵ

٨- وەكو مووسا هەموو ئەعزای كە ئەیبیست ڕۆژی كێوی توور
لەسەر تا پێم ئەناڵێ وەقتی هیجرت نەك بەتەنها دڵ

٩- ئەزانی قەدری (ئەحمەد) كەی ئەزانن ئەهلی ئەم شارە
لە دنیا دەربچێ‌و بمرێ و بچێتە ژێری خاك‌و گڵ

(١) گ: سوجدەو گوتی .

(٢) گ: ئەگەرچی قیبلەگاهی تۆ کەچە .

ئو: ئەگەر قیبلەگاهی تۆ کەچە .

(٣) گ: دەرگانەکەت شاهی لە من وون بوو .

ئو: دەرگانەکەت شاها لە من وون بوو .

(٤) ئو: کە دێیتە .

(٥) گ: توخوا هیچ مەیخەرە ژێر گلْ .

(٦) ئو: هەموو ئەعزاکەیی بیست .

(٧) گ: دەمی هیجرت بە تەنیا دڵ .

ئو: وەقتی هیجرەت بە تەنیا دڵ .

(٨)گ: ئەزانێ خەڵکی .

ئو: ئەزانێ ئەهلی .

٢- سورمەیە: کلە .

٣- تالع: بەخت . مەتڵەب: مەبەس:ئامانج .

٤- باتڵ: بەتاڵ .

٥- تەوافی کەعبە: سووڕانەوە بە دەوری کەعبەدا . مەنعە: قەدەغەیە .

٦- نازڵ: هاتووە خوار .

(٢٦)

١- وەختی ڕەحمە دولبەرا میوانی دەوڵەتخانەتم
تۆ ئەگەر لەیلای[١] منیش مەجنوونەکەی دێوانەتم
٢- حەیفە سا توخوا بەسە جەورو جەفاکەت تا بە کەی
من لە دەوری شەمعی ڕوخسارت وەکو پەروانەتم
٣- باعیسی ژین و حەیاتم یاری دڵ ڕەنجێنی خۆم
دەك بەلاّ گەردانی بالاّت و زڕەی پاوانەتم
٤- گەر لەموڵکی حوسندا، سوڵتانی[٢] ئەی یاری عەزیز
خۆ منی بێچارە جانا[٣] خادیمی دەرگانەتم
٥- قەیسی عامیر جێگەیی وادیی دووجەیل بوو چاوەکەم
خۆ منیش ئێستاکە[٤] وێڵی دەشتەکەی شیروانەتم
٦- یار بە خەندەی نازەوە ڕووی کردە من فەرمووی بەسە
بۆچی تۆ نازانی (ئەحمەد) دوژمنی[٥] بێگانەتم

---

[١] ئو: لەیلی .
[٢] ع: تۆ شاهی .
[٣] ع: خۆ منی بێچارەش ئێستا .
[٤] ع: وامنیش عەودالّ و
[٥] ع: دوژمن و

(٢٧)

١- دەمت بێنە بەقوربانی وەفاتم

قبووڵمە من لەجێی مووچەو بەراتم

٢- لەهیجرانا ئەوا ڕەنجوور و زارم

وەرە بالین هەتا ماوە حەیاتم

٣- هەموو کەس وەسفی یاری خۆی لەدەستە

بە غەیرەز من، کە هەر جوێنە خەلاتم

٤- لە تەختەی نەردی غەمدا، ئەی نیگارم

خەریکی شەشدەری هاتو نەهاتم

٥- وتی: خورشیدو مەه، ڕوویان ئەپۆشن

لەگۆشەی بانەوە، وەقتێ هەلاتم

٦- ئەڵێی (ئەحمەد) لە کوشتن ڕوو دەگێڕی

لە بەحسی عەشقدا من زۆر بەزاتم

٢- ڕەنجوور: بیمار، ڕەنج کێش . زار: بێ توانا، لاواز، ڕەنجوور .

٤- تەختەی نەرد: تەختەی یاری تاوڵە . شەشدەر: خانەی شەش .

٥- خورشید: ڕۆژ . مەه: مانگ، هەیڤ .

٦-بەزاتم: ئازام، بەجەرگم .

(٢٨)

١- به عەزمی[1] زیارەتی کوڵمت لە ڕێگەی دوورەوە هاتم
وەرە قوربان بکە ڕەحمیّ فیدای ئەو قەدد و بالاّتم
٢- هەمیشە حازرم بۆ قۆچی قوربانی نیگاری من
وها قەت تیّ مەگە بەندە کە زۆر شەخسێکی بیّ زاتم
٣- هەموو عالەم بە کەسبو کاریّ مەشغوولّن ئەما بەندە
هەمیشە عاشقی ڕووتم شەهیدی چاوی شەهلاتم
٤- دەمت غونچە، قەدت سەروە[2]، لەبت لەعلی بەدەخشانە
عەجەب شۆخێکی غەدداری فیدای ئەو زوڵفی تاتاتم
٥- بەئومێدی ویسالی تۆ لەڕێگەی پڕخەتەر (ئەحمەد)
پەناهەندەت بووم جانا، بکە ڕەحمیّ بە حالاّتم

---

[1] ئو: بەعەرزی .

[2] گ: قەدت عەرعەر .

١- بە عەزمی: بە مەبەسی، بەنیازی .

٢- بیّ زات: ترسنۆك، نەوێراو .

٤- لەب: لێو . بەدەخشان: ولاّتێکە بە لەعل بەناوبانگە .

٥- پەناهەندە: پەنابەر، پەنابردوو .

(٢٩)

١- لەشێخ و واعیزو سۆفی لەمەولا من کەنار ئەگرم
پیاڵەی مەی بە یادی دیدەیی مەستی نیگار ئەگرم
٢- لە شەوقی بەژن‌و باڵای تۆیە ئەی شۆخی پەری پەیکەر
لە باغا جێ لە سایەی عەرعەرو سەروو چنار[1] ئەگرم
٣- خەیاڵی مەمکەکانی گردو نەرمت دێتە بیری من
کە وەختێ پڕ بەچنگ لیمۆو بەی و سێوو هەنار ئەگرم
٤- خوڕەی فرمێسك و نەعرەو فوغانی[2] خۆم لەبەرچاوە
کە شەو من گوێ لە دەنگی نەعرەیی هەوری بەهار ئەگرم
٥- وتم چاکت ئەسیری حەلقەیی ئەو پەرچەمەت کردم
وتی شێتی بەتای ئەم زوڵفە من شێری شکا[3]ر ئەگرم
٦- بەقوللاپی مژەو حەڵقەی کەمەندی زوڵفی چین چینم
ئەگەر بێ ئارەزووم بێ ڕۆستەم و ئەسفەندیار ئەگرم
٧- ئیشارەی کرد برۆی یەعنی کە بۆ قەتڵی دڵی عاشق
لە پشتی چاوی یارۆ جێگەی سەد زولفەقار ئەگرم

[1] ز: سەرو و چنار .
[2] ز: فەنایی .
[3] ز: پەری شار .

٥- شکار: ڕاو، بەشوێنی بەردەلأنیش دەووترێت .
٦- مژە: برژانگ، مژیلان .
٧- یارۆ: یا یارەوە، یا (یارۆ) لەلای هەڵەبجەو ناوچافا جێی وشەی (هێن) ی سلێمانی و (هەرامە) ی سۆران‌و (ئەڤی دی) بادینان دەگرێتەوە .
زولفەقار: شمشێرەکەی ئیمامی عەلی یە .

(٣٠)

١- بە یادی چاوەکانت دایما من مەستو حەیرانم

لە عەشقی قامەتت قوربان وەکو زوڵفت پەرێشانم

٢- ئەوەندە من لەهیجری وەسڵی تۆ زاری ئەکەم جانا

وەکو داوێنی ئەڵوەن دایما من سوورە دامانم

٣- لە بۆ جارووبی ڕێگەت حازرم دایم گوڵی ڕەعنا

بەگۆزەی پڕ لە ئاوی دیدەو دوو گەسکی موژگانم

٤- صەلیبی زوڵفی تۆم خستۆتە گەردن بووم بە نەسرانی

ئیتر قوربان بکە ڕەحمێ نە دینم ما نە ئیمانم

٥- ئەوەند (ئەحمەد) کە مەدحی ڕوویی تۆی کرد شێتو ڕیسوا بوو[1]

بە خەڵڵاقی زەمین[2] لەم شیعرە چاتر بەندە نازانم

---

[1] لە دەستخەتێکدا: تۆی کردبوو بە عەیب .

[2] گ: ئەوە

٢- ئەڵوەن: ڕوباری ئەڵوەن .

٣- جارووب: گسك، مەبەست گسك لێ دانە .

(٣١)

١- خەیاڵم وایە خەڵقە من کە تەرکی عەشقی دولبەر کەم

ئیتر میهری پەری ڕوویان بە یەکجاری لە دڵ دەرکەم

٢- ئەگەر دڵ بێت و مەیلی گوڵڕوخانو نازەنینان کا

لە سینەی لابەرم، لەت لەت بەنووکی تیژی خەنجەر کەم

٣- لە داغی سیلسیلەی[١] تورەی[٢] نیگاری نازەنینی خۆم

ئەبێ تەرکی وەنەوشەو سونبولو هەم عەترو عەنبەر کەم

٤- ئەڵێن دولبەر لەگەڵ مندا[٣] دڵی ساردە، ڕەقیب شادە

ئەبێ خاکو گڵی عالەم ئیتر من هەر لەسەر سەر کەم

٥- کە باڵای دولبەری دی سەروی بوستانی[٤] وتی شەرتە

ئیتر خۆم دەرنەخەم، تەرکی لیباسو بەرگی ئەخزەر کەم

٦- هەتاکەی هەر لەدووریی ئەتۆ ئەمن بیمو بچم جانا[٥]

بەبێ سوود بۆچ[٦] نیگەهبانی گوڵو گوڵزاری بێ بەر کەم

٧- ئەگەر شەو سەر لەسەر خشتێ بکەم باکم نی یە چونکە[٧]

بە ئاوی دیدە ئومێدم وەهایە با لەشم تەڕ کەم

٨- وتی عاشق دەست بۆچی لە زوڵفم بەرئەدەی ئەمشەو

وتم تا کەی ڕەفیقی عەقرەبی جەڕڕارو ئەژدەر کەم

---

[١] گ: سیلسیلە .

[٢] گرە: مووی ناو چاو .

[٣] گ: لەگەڵ من زۆر .

[٤] گ: بۆستانم . ئو: بۆستان .

[٥] ئو: هەتا کەی من لە دووریی تۆ بیمو بچم جانا .

[٦] ئو: بۆچی .

[٧] ئو: چونکی .

٩- ئەگەر بێ[٨٧] ماچی لێوی دولبەرت تۆ دەس کەوێ (ئەحمەد)

حەرام بێ گەر ئیتر یادی بەھەشت و حەوزی کەوسەر کەم

---

[٨] گ: بێ و

١- میھر: خۆشەویستی، وەفا .

٢- گوڵڕوخان: گوڵڕوان .

٣- سیلسیلە: زنجیرە، تووڕە (گرە) .

٥- بۆستان (بستان): باخچە . لیباس: بەرگ . ئەخزەر: سەوز، کەسك . ٦

- نیگەھبان: ئاگادار، پارێزەر .

٧- بالش: سەرین .

٨- عەقرەب: دووپشك . جەڕاڕ: کوشندە . ئەژدەر: مار

